وەزارەتی راگەیاندن

بەڕێوەبەرێتی گشتی رۆشنبیری

کوردی

سەرەتایێک لە

www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي

# فیلۆلۆژی زمانی کوردی

محەمەد ئەمین هەورامانی

لە چاپخانەی مەعاریف لە چاپ دراوە ـ بەغداد

منتدى إقرأ الثقافي

وەزارەتی راگەیاندن
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆشنبیریی
کوردی

سەرەتایێك لە

# فیلۆلۆژیی زمانی
# کوردی

محەمەد ئەمین هەورامانی

زمانناسی (١)

لە ( ١٩٧٣/١١/٢٣ ) وە ئامادە کراوە

لە چاپخانەی مەعاریف لە چاپ دراوە ـ بەغداد

منتدى إقرأ الثقافي

# « پێشەکی » PREFACE

زانستیی زمان یەکێکە لەو زانستییانەی کە ناسراو و بە ناوبانگە لە ناو زانستییەکانی ئەمڕۆدا • ئەم زانستییە تاوەکو سەرەتای صەدەی نۆزدەهەم ، ناوبانگێکی وای نەبوە ، کە زۆر شایەنی باس بێت ، بەلاّم لەگەڵ سەر دەرهێنانی صەدەی بیستەمدا ، لە هەموو روویەکەوە ، پەرەی سەند وە بە تایبەتی لەم روانەوە :

١ ـ زانستیی مێژویی زمان (Diachronic Linguistics)

٢ ـ زانستیی ناوو نیشانی سەردەم (Synchronic Linguistics)

٣ ـ زانستیی بەراوردی زمان (Comparative Linguistics)

٤ ـ زانستیی دەستووری زمان (Structural Linyuistics)

وە هەریەکە لەمانەش لقو پۆپێکی زۆری دەرکرد ، وە بە تایبەتی ئەوەی چوارەمیان ، وە ئەوانەیش کە دەیانەویست زۆر وە بە قوولی زمانێ بناسن ، هەر یەکە خووی ئەدایە لێکۆڵینەوەی لقێک لەلقە زانستییەکانیا وە خۆی تیادا پسپۆڕ دەکرد ، چونکە لای هەموان ئاشکرایە پسپۆڕبوون لە شتێک دا ئاساترەو باشترە تاچەند شتێک •

ئەو لقانەی کە زۆر بە قوولیو وردوو درێژی لێیان کۆڵرابێتەوە ، ( فۆنۆلۆژی = Phonology) و ( مۆرفۆلۆژی = Morpholog) و ( سینتاکس = = Syntax) ن •

زمانی کوردی لەم رووەوە بەختەوەر نەبوە ، وە ئەو کوردەش کە ویستبێتی لە زانستیی زمانی کوردی بکۆڵێتەوە ، ڕێگایەکی زۆر هەڵەتی هاتوەتە بەر ، تاوەکو شۆرشی چواردەی تەمووز نۆصەدو پەنجاو هەشت ، ئەو کاتە نەختێ ڕێگا ئاچوغ کراو زۆر کەس ، لە زانیاری



منتدى إقرأ الثقافي

پەروەر ، کەوتە جموجۆڵ بۆ بووژانەوەو پەرەپێدان بە هەموو جۆرە زانیاری‌یەک ، وە بە تایبەتی پێویستی‌یەکانی ئەمڕۆ •

ئەوەی کە زۆر جێگای داخە ، لە ناوەوەی کوردستانی عیراق[1] بەشتێک نەکراوە کە ناوی بنرێ « زانستی‌ی زمانی کوردی » بەڵام نابێ ئەو پیاوەتی‌یەی ئەو زمان ناسە خۆشە ویستانەش‌مان لە بیرچێ کە بەپێی توانای خۆیان خزمەتی زمانی کوردی‌یان کردوە •

---

(۱) لەبەر ئەوەی کە زۆر خۆم بە قەرزاری ئەم زمان ناسە کوردانە دەزانم ( خاوەن مەقالەبێ ، یاخود خاوەن کتێب ) • لێرەدا وام بەباش زانی بەناوی سوپاس گۆنەوە ناویان بهێنم :

١ ـ مامۆستا سەعید صدقی « مختصری صرف‌و نحوی کوردی »
٢ ـ ،، تەوفیق وەهبی « دەستووری زمانی کوردی » بەغدا ١٩٢٧
،، « خوێندەواری باو » بەغداد ١٩٣٣
٣ ـ ،، نوری علی أمین « ڕێزمانی کوردی »
،، « پێشگر و پاشگر »
٤ ـ ،، علاءالدین سجادی « دەستوورو فەرهەنگی کردی » عارەبی فارسی •
٥ ـ ،، شیخ محمدی خاڵ « فەرهەنگی خاڵ » ج (١)
٦ ـ ،، جگەر خوێن آواو دەستورا زمانی کوردی
٧ ـ ،، د• نەسرین فەخری « چاوگی بێ واتا »
٨ ـ ،، مەسعود محمد ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد (١)
٩ ـ ،، د• عبدالله نقشبندی ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ژمارە(١)
١٠ ـ ،، د• نەسرین فەخری ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد (١)
١١ ـ ،، د• پاکیزە رەفیق حیلمی ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد(١)
١٢ ـ ،، تەوفیق وەهبی ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد (١)
١٣ ـ ،، د• کەمال فوئاد « زاراوەکانی زمانی کوردی » گۆڤاری زانیاری [٤]
١٤ ـ ،، د• پاکیزە رەفیق حیلمی « زمانی پەسەندکراو » دەفتەری کوردەواری (١)
١٥ ـ ،، د• پاکیزە رەفیق حیلمی « زمانی کورد » دەفتەری کوردەواری (٣)
١٦ ـ ،، ناکام « تیب‌و پیت » ڕۆژی کوردستان ٣ ، ٤/٩٧١



منتدى إقرأ الثقافي

بەڵام لە دەرەوەی کوردستان ، زۆر کەس ، وە بە تایبەتی لـە بێگانە رۆژهەڵاتناسەکان ( لە یەکیەتی سـۆڤیەتو ئەڵمانیـاو فەرەنسـاو ئینگەلتەرەو ئیتالیـاو دانیمارکو ئەمەریکا ) ، خۆیان خـەریک کـردوە بەناسینو شیکردنەوەی زمانی کوردیەوە وە لە هـەموو روویەکەوە ، ئەوەی کە زۆر جێگای داخە ، بە نیسبەت منەوە ، ئەوەیە ، تەنها توانیومە سوود لە هەندێ لێکۆڵینەوەی زمـانی کوردی کـە بەزمـانی ئینگلیزی نووسرابێ وەرگرم ، کە ئەوانیش وەکو ئەمانەو :

1 - Kurdish Dialect Studies 1
by D. N. Mackenzie

2 - Kurdis English Dictionary, Tawfiq Wahby
and C.J. Edmons.

3 - The dialecf of Auroman (Hawrāmānī Luhōn)
by D. N. Mackenzie

وەهەندێ تر ..

---

١٧ـ مامۆستا د. کەمـال فوئاد « چـەند سەرنجێکی زمانەوانی » رۆژی کوردستان ٢/٩٧١

١٨ـ ،، ادورد یوحنا « ملاحظات حول أصوات اللغـة الـكردية » رۆژی کوردستان ٥ ، ١٩٧١/٦

١٩ـ ،، لەکرەم قەرەداخی « لێکۆلینەوەی زمانی کوردی » رۆژی کوردستان

٢٠ـ ،، صادمق بهاءالدین « زمانی کوردی » رۆژی کوردستان ٥ ، ٩٧١/٦

٢١ـ ،، د. ئەورەحمان مارف «لە بارەی فۆنەتیکی زمانیکوردییەوە» ( بەیان )

،، د. ئەورەحمان مارف «لە بارەی فۆنەتیکی زمانیکوردییەوە» بەیان ١٢ ، ١٣

٢٢ـ بەهزاد « چاوگی کویرۆ بور » ( بەیان ) (٢)

٢٣ـ د. عیزەدین مستەفا « زمانەوانی » ( بەیان ) (٣ ، ٤)

د. عیزەدین مستەفا « فرمانی یارمەتیدەر »



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم چەند دێڕە کە لێرەدا نووسیومانە ، کراوە بە دوو بەشی سەرەکی یەوە :

بەشی یەکەم : کە بریتی‌یە ، لە :

( أ ) کورتە مێژووی زانستی‌ی زمان

(ب) زانستی‌ی زمان‌و ناوو نیشانی

(ح) لقە گرنگەکانی زانستی‌ی زمان

بەشی دووەم : کە بریتی‌یە لە :

( أ ) رەسەنی زمانی کوردی

(ب) زمانی کوردی لە رووی زانستی‌ی زمانەوە ؟

( فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و سنتیاکس ) •

بە کورتی ، هەر یەکە لە لقەکانی بەشی یەکەم‌مان باس کردوە ، وە لە بەشی دووەم‌دا بە درێژی باسی زانستی‌ی زمانی کوردی‌مان کردوە (ئومێدەوارم کە زۆر نەبێ کەم وابێ ) لە رووی ( دەنگ سازی : Phonology) و ( وشەسازی : Morphology) و ( رستە سازی : Syntax) وە •

---

٢٤ـ شوکور مستەفا «یش» بەپێی دەستووری زمانی کوردی (بەیان) (٤)

٢٥ـ مامۆستا صادق بهاءالدین « ئیدیە مێت کوردی »

د• عیزەدین مستەفا [ دیالیکتەکانی زمانی کوردی ]

[گیروگرفت‌و چارەسەر کردنیان]

د• نەسرین فەخری « بنەماکانی دانانی رێزمانی کوردی »

٢٦ـ د• ئەورەحمان مارف بنچینەی دانانی فەرهەنگێکی کوردی

گیروگرفت‌و چارەسەر کردنیان

محەمەدی مەلا کەریم ـ هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی

کەمال جەلال غەریب ـ هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی

پەروەردەو زانست

ژمارە (٦)



منتدى إقرأ الثقافي

له ( دەنگ سازی[٢] )دا باسی فۆنیمەکان و دەنگەکانمان کردوە وە ناوو نیشانی هەر یەکەیان بە پێی توانا هەڵمان داوە ، وێنەی دەنگی ساکارمان بۆ دەنگەکان داناوە کە لامان وایە زۆر ئاسانە بەکار هێنانیان ( لای هەموان ، ) بە مەرجێك لە پێشـەوە هـەوڵ بدرێت بـۆ زانینو رەوان کردنی کلیلەکانیان • بزوێنە شارراوە کانیشـمـان دەرخستـوە « کە وەکو کورتە سەر « فتحـە » و کـورتـە بۆر و زێـر و کورتـە وەستان بن » •

باسی ( وشەسازی = (Morphology مـان کـردوە وجـۆری ( مۆرفیمـە : Morpheme) کانمان ، بە پێی توانا جیـا کردوەتـەوە ، نموونەی ( هۆنراوە ) یا خود ( پەخشان ) مان بۆ هەر جۆرە مۆرفیمـە هێناوەتەوە •

باسی ( رستە سازی : Syntax) مان کردوە ، وەتێ کۆشاوین بـۆ بەش کردنی رستەکان بەپێی قـەوارەو ماناو ریزکـردنی وشـە ، وە نموونەمان بۆ هەربەشێ لەو بەشانە هێناوەتەوە وە بە پێی توانا رێگا پیشان دراوە بۆ دروست کردنی رستە ، ئەویش بە هۆی هانینەوەی نموونـەی سەرەکییەوە (Patterns) کە وەکو شێوە کلیشەیێ وایە •

لێرەدا ، ئیمە ، پەنامان بردوەتە سەرچاوەی خۆماڵیو بێگانە ، وە بەتایبەتی سەرچاوەی ئینگلیزیو عارەبیو فارسی ، وە بە درێژی ناوی سەرچاوەکانو خاوەن سەرچاوەکانمان هێناوە خۆمان زۆر بە قەرزاریان ئەزانین ،وە هـەرچی شتێکمان لـە هـەرسەرچاوەیەك وە رگرتبێ ، دەستمان بۆ سەرچاوەکەو لاپەڕەکەی راکیشاوە ، باسی رەسەنیزمـانی کوردیمان کردوەو کورتە بەراوردێکی زمـانی ئاوێستاو زارەکوردیـە

(٢) له ( دەنگ سازی ) دا ، نامیلکەیەکی بچکۆلەمان بـەلاو کـردەوە لە ژێر ناوو نیشانی « فۆنەتیکی زمانی کوردی » دا •



منتدى إقرأ الثقافي

کان مان کردوە ؟ وە زمانی ئەدەبی ئەمڕۆو پەنجاساڵ لەمەو پێش‌ترمان کورتە بەراوردێ کردوە ، لەم بەراوردانەدا توانیومانە بەڵگە بدەینە دەستەوە کە زمانی ئاوێستاو زارە کوردی‌یە کان لە بنەڕەتدا یەکن •

[ لەو بڕوایە دام ، وە لام وایە ئێوەش لە گەڵ من دان ، کە زمانی کوردی هەر وەکو زمانەکانی تر وایە ، وە هیچی لە هیچ زمانێك کەمتر نیە ، وە بۆ کوردەکان لە هەموو زمانێك بە کەڵک ترە ، بۆ ئەم مەبەستەش هەندێ بەڵگەی بڕوا پێ کراومان داوە بە دەستەوە ، زیاتر لە زانینی زمانێ ، زۆر شتێکی باش‌و پێویستە ؟ لە ناو کوردەواری‌دا زۆر باوە کە هەر کەسێ دوو زمان بزانێ وەکو دوو مرۆڤ بێ وایە ، وە ئەوەی سێ زمان بزانێ بەسێ مرۆڤ دەدرێتە قەڵەم • )

ئێمە لێرەدا ، زۆر کەم نزیکی رێزمان کەوتوین ، ئەوەی لێرەدا ویستومانە دەری خەین ئەوەیە :

**کە زمان یاسایەکی دەنگی رێکو پێك (System of Sounds) ی هەیە و بە هۆیەوە وشەو موفرەداتو رستە دروست دەبن بە شێوەی قسە لە دەمی مرۆڤەوە دەچنە دەرەوە •**

تەقالامان داوە ، کە شتێ پێویست نەبووبێ باسمان نەکردوە ، وە پیوەمانەوە هەڵ نەبەستوە بۆ مەبەستی ئینشای ئەدەبی‌و مۆسیقاو داڕشتنی بریقەدار ، هەرچی شتێك پێویست بووبێ وەکو موعادەلەیەکی وشك دراوە بە دەستەوە •

خۆمان نە بەستوە بە رێنووسێکی تایبەتی‌یەوە چونکە تا ئێستە رێنووسی زمانی کوردی نە چەسپاوە ، ئەمە لە لایەکەوە ، وە لە لایەکی کەشەوە زۆر وشە هەن کە لە لایەن نووسەرانەوە ، بە چەند جۆرێ ئەنووسرێن وە بە راستیش دەدرێنە قەڵەم ، وە منیش باوەڕم وایە •

زاراوی باوم بە کار هێناوە ، وە ئەگەر زیاتر لە زاراوێك هەبووبێ



منتدى إقرأ الثقافي

بۆ یەك شت ، من هەموویا نم بە کار هێناوە ، وە خۆم نە بەستوە بە یەکێکیانەوە •

فەرهەنگێکی بچکۆلەم ، بۆ ئەو زاراوانە کە بە کارم هێناون داناوە هیوا دارم راماڵی بۆ خوێنەر بکات •

بۆ دوا جار سوپاسێکی بێ پایان پێشکەش بەوانە ئەکەم کە هەڵەم بۆ چاك یا خود بۆ راست دەکەنەوە ، یاخود پێشنیاریان ئەدەن ، سا بە هەر جۆرێ بۆیان دەلوێ ، بۆ پەرە پێدان بەم گۆشەیەو فراوان کردنی بۆ سوودی گشتی •

( نووسەر )



منتدى إقرأ الثقافي

# کورته مێژوویەکی زانستیی زمان :

زمان ناسەکان ، هێشتا لە رووی چۆنیـەتی پەیدا بوونی زمانـەوە یەکیان نەگرتوە ، بەڵام ئەوەی ئاشکرابێ ئەوەیە کە نووسین دۆزرایەوە ، گۆڕانێک و پێشکەوتنێکی زۆر گرنگ‌و فراوان لە گیـانو سـروشتی کۆمەڵایەتی‌و مێژوویی مرۆڤایەتی‌دا رووی‌دا ، شتەکە زۆر ئاسایی‌یە ، کە جیاوازی دەر دەکەوێ لە میانەی زمان‌و یەکێکی تردا ، وە میانەی زمانی سەردەمێک‌و سەردەمێکی تردا ، ئەم جۆرە جیاوازیانە بوون بـە هۆی ئەوەی کە زمان ناس پەیدا بین •

درێژەی نەدەینێ ، ئەوانە کە زۆر لە مێژەوە زمانیان ناسی‌بێ‌و لە زمانیان کۆڵیبێتەوە ، سانسکریتیەکانن •

پـانینی ( Panini ) هیندی مـەزن بـە دێرین ترین زمـان‌نـاس دەژمێردرێت لـە گێتی‌دا ، وە بـە جـۆرێ زمـانی هیندی کـۆنی شی کردوەتەوە ، کە تاوەکو ئێستاش زمان ناسەکان هەر لەسەر ئەو رێ‌و شوێنە دەڕۆن •

پانینی ( Panini ) نزیکەی (٢٥٠٠) ساڵێ لەمەوپێش بەم جۆرەی خوارەوە ناوو نیشانی زمانی سانسکریتی هەڵداوە :

**« زمان بریتی‌یە لە نیزام ( یاسا ) یێکی دەنگی ڕێک‌و پێک • »**

یۆنانیە کانیش شتێکی کەمیان نەزانیوە لە بابەت زمانەوە ، زۆر بـە قووڵی‌و فراوانی لە زمان و دەنـگـەکـانی دواون ، بـەڵام زیاتـر بـە میکروسکوبی میتافیزیقی لێکیان دەدایەوە ، وە زیاتر بەلای فەلسەفەدا دەڕۆیشتن تا شتێکی‌تر •

لەو یۆنانیە دێرینانەی کە بەزمان ناسینەوە خۆیان خەریك کردبوو



منتدى إقرأ الثقافي

مامۆستا ( پرۆدیکۆس = Prodicus ) و مامۆستا ( ئیفلاطون = Plato ) و چەند کەسێکی تر •

مامۆستا ئیفلاطون ، کە لەساڵی ( ٤٢٧ – ٣٤٧ پ • ز ) لە گفتوگۆکەیدا ، باسی لێکۆڵینەوەی بنەڕەتی وشە دەکات ، وەلێکۆڵینەوەی پەیوەندی میانەی ( شتو مەکۆ وشە ) دەکات • ئەو لێکۆڵینەوەی مامۆستا ئیفلاطونە ، بۆ ساڵەهای ساڵ ، بوو بە دەست مایەی لێکۆڵینەوەی زمان ناسەکان ، هەر لە دێرینیەکانەوە تا وەکو ئەمانەی ئەم سەردەمەش ••

زمان ناسە یۆنانیە دێرینیەکان تەنها خەریکی زمانەکەی خۆیان بوون ، وە وایان دەدایە قەڵەم کە ڕێزمانی زمانی ( یۆنانی کۆن ) بۆ هەموو زمانێکی کە ، دەشێ ، وە هەر لەبەر ئەو ناوو نیشانەش بوو کە مامۆستاکانیان هەر وشەو ڕێزمانیان فێری قوتابیان دەکرد •

ڕۆمانیەکانیش ، لەم ڕووەوە ، بە قوتابی یۆنانیەکان دەژمێرێن ، لە دەوروبەری ( چەرخی دووەمی پێش زایین ) دا ، دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی زمان ( زانستیی زمانی لاتینی ) ، وە بۆ ئەم مەبەستەش هەر لەسەر ڕێو شوێنی یۆنانیەکان دەڕۆیشتن بە ڕێوە •

زمانی لاتینی ، پەرەی سەندو بوو بە باو لە ئەوروپادا ، هەر وەها ڕێزمانەکەشی ، وە بە تایبەتی لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا • ئەمە لە ڕۆژ ئاوادا ، بەڵام لە ڕۆژ هەڵاتا ، وە لە هەمان سەر دەمدا ، دەستکرا بە لێکۆڵینەوەی زمانو ڕێزمانی زمانی قورئانی پیرۆز ! بە ناو بانگترین زمان ناس ( أبی الأسود الدؤلی ) بوو • هەر لم سەردەمەدا ، دوو جۆرە قوتابخانە ، بۆ لێکۆڵینەوەی زمانو ڕێزمانی عارەبی پەیدابو ، کە ئەوانیش ، قوتابخانەی ( بصره ) وە ( کوفه ) بوون • بە ناو بانگترین زمان ناسی ئەو سەردەمەی عارەب ، مامۆستا ( خلیل أحمد الفراهیدي ) ،



منتدى إقرأ الثقافي

وەقوتابی بلیمەتی بەناوبانگی ( سیبویە ) کە بە بەناونگترین وباشترین دانەری کتێبی ( نحو ) و (معجم ) دەژمێررێت •

دوا بە دوای چەرخە ناوەڕاستیەکان ، زمان ناسە ئەوروپاییەکان دەستیان کرد ، بە لێکۆڵینەوەی هەندێ زمانی تری ، غەیری زمانی لاتینی و یۆنانی ، کە وەکو زمانی ( سریانی ) و ( عیبری ) و ( عارەبی )و حەبەشیو •• هتد ) •• بە ناو بانگترین رۆژ هەلاّتناس ، لەم رووەوە ( تیسێوس ئەمبرۆجیو = Theseus Ambrogio) ی ئیتالی ( ١٤٩٦ - ١٥٤٠م ) وە ( لیونارد ئەبلا = Leonard Abela) ی مالطی بوون •

لە دەورو بەری چەرخی هەژدەهەمدا ( سێر ولیام جۆنز = Sir William Jones) ی ئینگلیزی توانی پەیوەندی میانەی زمانی سانسکریتیو یۆنانیو لاتینی دەرخات ، بەم جۆرە زمان ناسەکان ، رێگایەکی نوێیان بەکار هێنا بۆ دۆزینەوەی جیاوازیو لێکچوونی میانەی زمانە هیندۆ - ئێرانیەکان و هیندو -ئەوروپاییەکان ( بەم رێگا نوێیە دەوترێ : لێکۆڵینەوەی بەراوردی ) ، ئەم رێگا نوییە دەورێکی بالاّی هەیە لە گەشە پێ کردنو پەرە پێدانی بەشی لێکۆڵینەوەی زانستیی‌زمان ، وە جیا کردنەوەی زمانەکانی خێزانی هیندو - ئێرانی •

لێرە ، زۆر پێویستە کە ئەوەمان لە بیرنەچێ ، هەر وەکو زمان ناسەکانیش خۆیان دانیان بەوەدا ناوە ، کە زمان ناسە ( سانسکریتیەکان ) خزمەت گوزارییەکی بێ پایانی زمانیان کردوە ؛ بەوەی کە بە وردی باسی دەنگ سازی زمانی سانسکریتیان کردوەو زمان‌ناسە رۆژ ئاواییەکانیش توانیویانە ، لە سەر کەلەپووری ئەوانەوە ، زیاتر ، پەرە بە لێکۆڵینەوەی زمان بدەن ، بە تایبەتی لە رووی دەنگ سازییەوە ، (فۆنۆلۆژی = Phonology) . « سیبویە ، چۆن بوە بۆ زمانی عارەبی ، ( پانینی )ش وا بووە بۆ زمانی سانسکریتی » •



منتدى إقرأ الثقافي

لێکۆڵینەوەی زمان بە شێوەیەکی زۆر وردو نوێ لەگەڵ سەر دەرهێنانی چەرخی نۆزدە هەما دەستی پێ‌کرد ، چونکە پەیدا بوونی پەیوەندی خەڵکە رۆژ ئاواییەکان بە خەڵکەکانی تری جیهان ، بە ناردنی ( هەیئاتی دیبلۆماسی ) و رۆژهەڵاتناسی و بازرگانی و شتی‌تر ، بوو بە هۆی ئەوە کە بەشی لێکۆڵینەوەی زمان فراوان بکەن ، بیرو رایان دەربارەی هەر زمانێ لەو زمانە بێگانانە ، ئەو شتانە کە کاریان کردوەتە سەرهەر زمانێ ، زمانی سەردەمی هەر زمانێ ، پەیوەندی نێوان زمانەکانی هەر خێزانێ ، باشترین رێگا بۆ فێرکردنی زمان .... هتد ، .

ئەوانەی کە زۆر شایەنی باس بن لەم رووەوە ، زمان ناسی ئەڵمانی ( فرانز پۆپە = Franz bopp ) ، کە لێکۆڵینەوەکانی بریتین لە لێکولینەوەی بەراوردیو گۆڕرانو مێژووی زمان ، وە گرنگترین بەلاو کراوەکانی بەم ناو و نیشانەیە : (System der Konjugation des Sanskrit) وە ( جاکۆب گرێم = Jacob Grimm ) کە بە خوای ( رێزمانی بەراوردی = النحو المقارن ) دەژ مێررێت ، وە ( پۆت = August Friedrich Pott ) کە رێزمانی هیندۆ ـ ئەورویی داناوە .

فەرەنساویەکان دەس پێشخەریان کرد بەوەی کە لە ساڵی ١٨٦٦م لە پاریس‌دا کۆمەڵی ( زمان‌ناسیان )[١] دانا بۆ ناسینو لێکۆلینەوەی زمان لە هەموو روویەکەوە .

ئینگلیزیەکانیش هاوکاری ئەم جۆرە زانستی‌یانە یان‌کردوە ، مامۆستا ( هنری سویت = Henry Sweet ) ( ١٨٤٥ ـ ١٩١٢ ) زوربەی وەختی خۆی تەرخان کردبۆ لێکۆلینەوەی زمان ( زمانی زیندو ، ناو و نیشانی زمان ) ، وە گرنگترین بەرهەمی

---

(١) زماننناس ( زمانەوان )



منتدى إقرأ الثقافي

(Hand book of Phonetics) ، (Primer of Spoken English) •

دوا بە دوای چەرخی نۆزدەهەم ، زمان ناسەکان ، بەجۆرێکی تر تەماشای زمانیان کرد ؛ (واتا ، وایان دی ، کە زمان یا سایەکە ، دروست بوە لە کەرەسەی هەمە جۆر ، وە هەر یەکە لەو کەرەسانە پەیوەندی بە تینی بەوی ترەوە هەیە ) • پاڵەوانی ئەم بیرو رایە (فردیناند دی سۆسیر) ( ١٨٥٧ ـ ١٩١٣ ) بوو ؛ لەم دواییەدا بیرەکەی ( دی سۆسیر ) کە ( فۆنیم ) بوو هاتە دی‌و رۆشن بوەوە ، بەو جۆرە ، لقێکی نوێی زانستی‌ی زمان هاتە کایەوە ، کە ئەویش پێی دە وترێ ( فۆنۆلۆژی = Phonology) ، وە لە هەموو وڵاتانی ئەوروپادا ، بەرپا بوو •

لە وڵاتانی ( دانیمارک ) یش‌دا ، مامۆستا ( یسپرسن و پدرسن ) خەریکی زانستی‌یەکانی زمان بوون‌و زوربەی نووسینەکانیشیان بە ئینگلیزی‌و فەرەنساوی بەڵاو دەکردەوە ؛ گرنگترین نووسینەکانیان ئەمانە بوون :

"Languag, Its Nature, Development and Origin."
"Philosophy of Grammar"

لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا ، ئەم جۆرە زانستی‌یە زۆر پەرەی سەندوە ، وە بە تایبەتی لەسەرو کلاوی مامۆستای مەزن (Leonard Bloomfield) ( لیونارد بلووم فیلد ) ( ١٨٨٧ ـ ١٩٤٩ )وە مامۆستا ( ئەدوارد سەپیر = Edward Sapir) دا • بەناو بانگترین بەرهەمی مامۆستا بلووم فیلد ، ئەمەیە (Linguistic Structure) .

بێ گومان هەر جۆرە زانستی‌یەک کە تۆ بیگری گەشە دەسێنێ‌و پێش دەکەوێ ، بەڵام ناگاتە پۆپە[٢] و تەواو نابێ ، هەروەها

(٢) پۆپە ( قمە )



منتدى إقرأ الثقافي

زانستی‌یەکانی زمانیش •

بەناو بانگترین زمان ناسی ئەم سەردەمە مامۆستا ( فریز )و یارمەتی دەری مامۆستا ( لادۆ )ن ، ئەم دوانە بەیارمەتی‌دانی یەکتری توانیان بە چاوێکی فرە دووربینینەوە سەیری زمان بکەن • وە بە پێی ئەم بینینە نوێ‌یە توانیان باشترین رێگا بۆ دەرس وتنەوە بدۆزنەوە ، وە بە زوو ترین کات قوتابی فێری زمانی بێگانە بکەن •



منتدى إقرأ الثقافي

## زانستی‌ی زمان LINGUISTICS

زانستی‌ی زمان ، ئەو زانستی‌یەیە کە تەقالا دەدات بۆ شی‌کردنەوەو ناسینی ناوەڕۆکی زمان ، وە ڕێگـا دا دەنێ بـۆ پێکەوە نانی کەرەسەی زمان لە سەر ڕێو شوێنێکی زانستی بنەو ٠

مامۆستا محمود السعران لە کتێبەکەی‌دا ( مقدمـه علم اللغـه ) بەم جۆرەی خوارەوە ناوو نیشانی زانستی زمانی هەڵداوە :

« زانستی زمان ئەو زانستەیە کە زمانی کردوە بە سەر باسی ٠ » ٠

بە شێوەیەکی گشتی زانستی‌ی زمان ئـەم زانستیانەی خـوارەوە دەگرێتەوە :(٣)

**١ ـ زانستـی‌ی مێـژوویی زمـان** (Diachronic Linguistics)

ئەمەش ، ئەو زانستەیە کە لە ( گۆڕان ) و ( بەسەرهاتی ) کەرەسـەی زمان دەکۆڵێتەوە ، شان بە شانی بەسـەر چوونی کـات ( واتا گۆڕانو بەسەرهاتی : دەنگ‌و وشەو ڕستەو موفرەدات )

**٢ ـ زانستـی‌ی زمـانی سـەردەم** (Descriptive Linguistics)

ئەمەش جۆرە زانستێکە ، کە تاریفی زمان دەکات لە کاتێک‌دا وەلێ‌یشی دەکۆڵێتەوە لە وەخت و ساتی ( سەردەم ) لێکۆڵینەوەکەدا ، گرنگترین شت کە پەنای بۆ دەبرێ ، لەم زانستی‌یەدا ، گفت‌و گۆی دەمی‌یە ٠

**٣ـزانستی‌ی لێکۆڵینەوەی بەراوردی** (Comparative Linguistics Studies)

ئـەمـە ، بریتیـە لـە جـۆرە لێکـۆڵینەوەیـەك ، کـە پێی دەوترێ « لێکۆڵینەوەی بەراوردی » کە بەکار دەهێنرێ لە نێوان دوو زمان یـا پتردا ، یا لە ناو کەرەسەی زمانەکە خۆی‌دا ، بۆ ڕۆشن کـردنـەوەی

---

(٣) مامۆستا د٠ خەلیل حەماش ( A Course in English Linguistics)



منتدى إقرأ الثقافي

سێ شتی گرنگ :(٤)

١ ـ ئەو شتانەی کە وەکو یەکن •

٢ ـ ئەو شتانەی کە جیاوازن لەیەکتری •

٣ ـ ئەو شتانەی کە لە زۆر شتدا وەکو یەکن جگە لە شتێکی بچکۆلە نەبێ ( یا هەندێ شتی شارراوە ) •

**٤ ـ زانستی دەستووری زمان** (Structural Linguistics)

ئەو زانستەیە ، کە ناوەڕۆکی زمان ، وە بە وردی ، شی دەکاتەوە وە ڕێگا دادەنێ بۆ پێکەوە نانی کەرەسەی زمان لە بەر ڕۆشنایی زانستی‌یەکی بتەودا •

وەختێ کە زمان ناسی ڕاستەقینە ، بیەوێ لە زمانێ بکۆڵێتەوە ، لام وایە ، لە پێشەوە تەماشای کەرەسەکانی زمان دەکات ، وە لە پێش هەموو شتێکەوە ، لە کەرەسە سەرەتایی‌یە بنەڕەتی‌یەکان ورد دەبێتەوە ، واتا یاسای دەنگی ئەو زمانە ، چونکە ڕێک‌و پێکی یاسای دەنگی‌و ڕاستی‌و ڕەوانی بەکار هێنانی ، باشترین هۆیە ، بۆ تەرجومە کردنی ( خۆ ) بە خەڵکی •

بە پێی ورد بوونەوەو شی‌کردنەوەی زمان لە کەرەسە بنەڕەتی‌یەکانەوە،تا دەگاتە قەوارەی گفت‌و گۆ کردن ، زمان ناسەکان ، وە بە تایبەتی ( دەنگ سازەکان = Phonetician ) وا داویانەتە قەڵەم ، کە زمان بریتی‌یە لە سێ کەرەسەی سەرەکی گرنگ ، کە ئەوانیش :

١ ـ ( فۆنیم = Phoneme)

٢ ـ مۆرفیم = Morpheme)

٣ ـ سینتاکس = Syntax) •

---

(٤) د• خەلیل حەماش • The Methods of Teaching:



منتدى إقرأ الثقافي

**فۆنیم : Phoneme**

زاراوی فۆنیم ، چەند زاراوێکی لێ دروست کراوە کە وەکو :
زاراوەکانی ( فۆنۆلۆژی = Phonology) [٥] واتا ( دەنگ سازی ) ، کە
**زانستێ کەخۆی تەرخان کردوە بۆ لێکۆلینەوە لە دەنگەکانو فۆنیمەکانی زمان لەسەر رێو شوێنێکی زانستی بروا پێکراو ،**
وە زاراوی ( فونەتیشان = Phonetician) ، واتا ( دەنگساز ) کە ئەو
زانایەیە ، لە دەنگەکانو فۆنیمەکانی زمان دەکۆلێتەوە ؛ گیرو گرفتیان
دەر دەخات و چارەسەریان بۆ دائەنێ .

بۆ ئەوەی ناوو نیشانی ( فۆنیم : Phoneme) روون بێ لە
خوێندەوارانەوە ، وا لە خوارەوە چەند ناوو نیشانێ دەنووسین لە
(The Shorter Oxford English Dictionary) دا ، لاپەڕە ( ١٤٨٩ ) ناوو
نیشانی فۆنیم ، بەم جۆرەیە :

"Phoneme : A speech - Sounds considered in respect of its functional relations in Linguistic System."

وە لە فەرهەنگی « المورد »دا بەم جۆرەیە :

« الفونیمه : احدی وحدات الکلام الصغری التی تساعد علی تمیز نطق لفظة اخری في لغة أو لهجة . »

وەلە فەرهەنگی :

The Advanced Learners Dictionary of Cuvrent English

بەم جۆریە :

"Family of related speech. Sounds in particular Language."

---

(٥) بە کورتی ئەم زانستییە بریتییە لە لێکۆلینەوە لە : دەنگەکانی زمان ، وپرۆزودی : (Prosody) , (Pitch & juncture) .
وە جۆری هۆنراوەو قافیە .



منتدى إقرأ الثقافي

وە لە کتێبەکەی ، مامۆستا دە خەلیل حەماش کە عەمیدی کۆلیجی ئادابە ، وە ناوەکەی ئەمەیە : "A Course of English Linguistics" بەم جۆرەیە :

"a phoneme is usually a group of sounds rather than a single sound."

وە هەر لەهەمان کتێبدا ، لە لاپەرە (١٤)دا مامۆستای ناوبراو بەم جۆرەی خوارەوە جۆرەکانی فۆنیمی جیا کردوەتەوە :

"Modern Linguistics studies tend to classify the Phoneme of Language under the following headings:

1 - The segments:

a. The consonants
b. The Vowels, and
C. Combinations of Segments:
   1. Consonant clusters
   2. Diphthongs and
   3. Patlerns of assimilation

11 - The supersegments

a - Stress b. Pitch, and c. Juncture."

وە لە هەندێ کتێبدا ، بۆ نموونە وەکو ئەمە :

" Studies in Phonetics and Linguistics
by
David Abercrombie "

وتراوە : کە زاراوی ( فۆنیم : Phoneme ) هەر زۆر لە مێژەوە هەیە ، وە گومانیشی تیا نیە کە بوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دانانی ئەلفو بێ ، هەر وەها ئەم زاراوە کۆنە لە مێژەوە لە باتی وشەی «وشە» بەکار هێنراوە .

لەم ناو نیشانانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە ( فۆنیم ) بریتیە لە :

المكتبة المركزية / جامعة السليمانية



منتدى إقرأ الثقافي

١ ـ کۆمەڵە دەنگی هەمەجۆر ، کە بوون بەیەك بـۆ پێکهێنـانی وشەیەکی خاوەن واتای سەر بەخۆ، وەك ئەمانە: ( Find ) وە ( Kind ) یاخود وەك ( کڕین ) وە ( فڕین ) •

٢ ـ یاخود چەند دەنگێکی جیاواز کە هەر ( کۆنسوناتە ) یا هەر بزوێنەی ئەیدا لەجێگای جیاواز جیاوازدا ، وەك کۆنسوناتی ( فۆنیم ) / K / کە نزیکەی چوار دەنگی هەمەجۆری هەیە لەم جێگـا هەمە جۆرانەدا کە لەم وشانەدا هەن :

أ ـ cat / kat / ( کات ) •

ب ـ kurd / kurd / ( کورد ) •

ج ـ keen / ki:n / ( کین ) •

د ـ back / bak / ( باك ) •

لێرەدا ، دوور نیە کە ئـەم پرسیارە بێتە پێشـەوە : بۆچی ، لێرەدا کۆنسوناتی / K / فۆنیمە ؟!

ئەم کۆنسوناتە فۆنیمە ، جونکە :

١ ـ لە نموونەی یەکەمدا ، دەنگی /ك/ کە وەکو کورتە سەری بـە سەرەوە بێ وایە •

٢ ـ لە نموونەی دووەمدا ، دەنگی /ك/ کە ، وەکو کورتە بۆری بە سەرەوەبێ وایە •

٣ ـ لە نموونەی سێیەمدا دەنگی /ك/ کە ، وەکو ژێری لەژێردا بێ وایە •

٤ ـ لە نموونەی چوارەمدا دەنگی /ك/ کە ، هێز دارەو وەستاوە •

لێرەدا بە هەر یەکە لەم دەنگی /ك/ یە کە لە هەر نموونەیەك دایە دەوترێ (allophone) ، وە بە هەمو دەنگە جیاوازییەکانی دەنگی /ك/ ، لە جێگـای جیاواز جیـاوازدا دەوتـرێ فـۆنیـم (phoneme)



منتدى إقرأ الثقافي

یا خود ( کۆنسونانت :consonant) .

بۆ زیاتر رۆشن‌کردنەوە ، دەنگە بزوێنی / ە / دێنینە کایـەوەو دەڵێن ئەمە دەنگە، تاقە دەنێکە یاخود (allophone) ە ، وە فـۆنیم نیـە ، چونکە ، هەر چەندە لە جێگای جیاواز جیاوازدا ، بەکاری بهێنین ، هەر هەمان دەنگ ، بە هەموو نادو نیشانێکەوە ، دەداتو جێگا نەیگۆڕی‌وەو نـایگـۆڕێ ، بـۆ نمـوونـە ورد بـەرەوە لـــەم دەنـگـانـە / ە / : ( وەرە ) ، ( سەر ) ، ( بەر ) .

**مۆرفیم : morpheme**

مۆرفیم (morpheme) هەر وەکو مامۆستا (بلووم فیڵد) و توویەتی : « بچووکترین « پارچەی واتا داری زمانە » . مۆرفیم چـەند زاراوێکی لێ دەبێتەوە ، کـە ئەوانیش وەکـو : ( مۆرفۆلۆژی : (morphology) یا خود ( وشەسازی )ە کە ، ئەویش : ئەو زانستەیە کـە لـە ( مۆرفیـم morpheme) ی وشەی زمان دەکۆڵێتەوە ، لە رووی قەوارەو ( Form ) جۆرو مانایەوە . وە (مۆرفۆلۆجیست : morphologist) یاخود (وشەساز)، ئەو زانایەیە کە خۆی تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە لە وشەسازی .

**سینتاکس : Syntax**

سینتاکس یاخود ( رستەسازی ) ئەو زانستەیە کە لە ریز کردن و ئەرکی وشەی زمانێ لە رستەدا ، وە بە پێی یـاسـای ئـەو زمـانـە ، دەکۆڵێتەوە ، وە چەند رێو شوێنێکی رێزمانی دادەنێ بۆ ئـەو جـۆرە ئەرک و ریز کردنە وەئەم زاراوانـە شـی لێـوە دروسـت دەبێ ، کـە ئەوانیش ( رستەساز ) واتا ئەو زانایەیە کە خۆی تەرخان کردوە بـۆ ناسینی یاسای چۆنیەتی دروست‌کردنی رستە لە زمـانێکدا ( رستەش ؛ پێك هاتوە :

لە چەند وشەیەك یاخود چەند دەنگێکی ریزکراوی ئەو تۆ کـە بە پێی یاسای دەنگی ئەو زمانە واتایەکی پڕ ئەدەن ) .



منتدى إقرأ الثقافي

# « زمانو ناوو نیشانی »

هەر زۆر لە مێژەوە زمان ناسەکان ، خەریکی ئەوە بوونو هێشتا هەر خەریکن ، کە هەموو شتێ لە بابەت زمانەوە رۆشن بکەنەوەو هیچ شتێکی پەناواکی نەهێلن • لە هەندێ رووەوە سەرکەوتون و گەیشتوونەتە پۆپە ( قمە ) ، بەلاّم لە هەندێ رووی ترەوە هێشتا لە سەرەتادان ، چونکە نەیان توانیوە بەلّگەی وا بدەنە دەستەوە ، کە جێگای بڕوا بێت و پەنای بریتی ( بۆ نموونە چۆنیەتی دروست بوونی موفرەدات لـە بنەڕەتدا ) بەلاّم بە نیسبەت زمانی کوردی‌یەوە ، ئەو شتەکەمەی کە کراوە ، تارمایی هەر بەرچاو ناکەوێت لە چاو زمانەکەو زارەکانی‌دا •

**زمان خوویەکی مرۆڤایەتی‌یە :**

بۆ رۆشن کردنەوەی ، ئەم تەباتێلّە وای بە باش دەزانین ، کـــە پەنا بەرینە ( منالّ ) لە دایك بوونیەوە تا وەکو زمان فێر بوونی ، واتـا ، کورتە سەرگوزەشتەیەکی وەر گرینو بەراوردی کەین لەگەلّ نەزریاتی زماندا •

**منـالّ**[٦] ، وەختێ هاتـە دنیـاوە ، هیــچ جۆرە گفت و گۆیەك نازانێ ، وە هیچ‌جۆرە وشەیەك نازانێ ، جگە لە هەندێ دەنگە دەنگ نەبێ کە ئەویش ( گریانە ) ، لام وایە کـە زۆر کـەس بتوانێ هـۆی گریانی منالّ لێك بداتەوە !! گریانی منالّ ، لەم کـاتو تـەمـەنـەدا ، دەگەڕێتەوە بۆ هۆی کیمیاوی‌و فیزیاوی ، وە بە شێوەیەکی روونـتـر منالّ بیری لە گریان نەکردوەتەوە • ئەو ئێشە ، یاخود ئەو برسیـەتی‌یـە کارێکی دوولانەی ئالّۆزاوی کردوەتە سەر ئـەو منالّـە ، ئـەم کـارە

---

(٦) کتاب الطفل ، کل ما یجب أن تعرف عنه ـ مطبعة الشرق الاوسط ـ بیروت ـ لبنان •



منتدى إقرأ الثقافي

ئاڵۆزاوە کاریشی کردوەتە سەرجیهازی هەناسەدان ، وە بە دەرچوونی هەوای ناو سی‌یەکانەوە شەکانەوەی ژی‌یە ( اوتار الصوتية ) دەنگیەکان، چەند دەنگێکی ناڕێکی یەک بەشوێن یەک‌دا دێتە دەرەوە ، کە ئەمانەش گریانە ٠

منداڵ ٠ لەکێ‌وە نزیک بێ ، وە کێ ، بەخێوی کات ئەوە بە خۆشەویست ترین کەسی دەزمێرێت وە هەرچی شتێ فێر ببێ ، لەوەوە فێر دەبێ ( خوو و رەوشت ، هەر وەها خوو رەوشتی گفتو گۆش )[٧] ٠

مناڵە ، لادی‌یەک ، زاری لادێ‌کە فێر دەبێ واتا هی دایکی فێر دەبێ ، وە مناڵە شاری‌یەک زاری شارەکە فێر دەبێ ، وە بۆ زیاتر روون‌کردنەوە ، با وادابنێین کە پیاوێکی عارەب ژنێکی‌کوردی هێناوە ، دەبینین کە مناڵەکەی لە پێش عارەبیەوە فێری زمانی کوردی دەبێ ، ئەگەر چیش لە ناو کۆمەڵگایەکی عارەبی‌دا بژی بە مەرجێک دایکەکە ، یاخود ئەو کەسە مناڵەکە بە خێو دەکات بە زمانی کوردی بیلاوێنێ ٠

ئایا منداڵ ٠ بە تاق‌و تەنیایی ، وە هەر لە خۆیەوە زمان فێر دەبێ ؟؟!!

منداڵ ٠ ئەگەر بێتو لە ژوورێک دابێ‌و لە دوورەوە سەر پەرشتی‌و چاو دێری بکرێ ، بەلأم گفتو گۆی لە گەڵ دا نەکرێ ، وە نەش کرێ بە کارێ کە هیچ دەنگێکی گفت‌و گۆ ، یا هەر شتێکی تر لەم رووەو بیبسێ، لام وایە ( هەرچی من تاقیم نەکردوەتەوە ، بەلأم دە لێن تاقی کراوەتەوە )بۆ هەر شتێ دەنگێ یا کۆمەڵە دەنگێ دا دەنێ ، بە بێ بیرکردنەوە کە ئەو دەنگە یا خود ئەو کۆمەڵە دەنگانە باشن یا خرابن ٠

(٧) مقدمة علم اللغة ، ص ٥٩ الدكتور محمود السعران ٠



منتدى إقرأ الثقافي

ئەگەر بەم جۆرەی سەرەوە ، چەند منالێك پێكەوە بژین بـۆ چـەنـد ساڵێك هیچ گومانی تێدا نیە کـە زمانێك دروست دەبێ لە نێوانیانا کە لە زمانی دایكو باوكو هیچ زمانێکی تر نەکات •

منالّ • بۆ یەکەم جار فێری وشەی ( دایە )[٨] دەبێ ئەگەر منالّ هەبێ لە لایەوە یا لە نزیکیەوە ، بە شێوەیەکی روون تر ، منالّ فێری ئەو وشەیە دەبێ ، وە بۆ هەوەڵ جار ، کە زۆر بوترێتەوە ، لە لایەن ئەوانەوە کە لەو ماڵەدا ، وە لەگەڵی دەژین •

منالّ ، تەنها ئەوە دەزانێ کە بیستویەتی ، هەر موفرە داتێك یـا خود هەر وشەیەك کە نەی بیستبێ نایزانێ ، بۆ نموونە ، ئەگەر منالّە کوردێك لە کۆمەڵگایەکی عارەبیدا بژیت ، لە پاش تێپەڕ بوونی دوو ساڵێ بە سەر تەمەنیدا ، دێتەوە ماڵەوە ،وە زوربەی ئەو زاراوانەی کە بەکاریان دەهێنێ عارەبین ، وە وا دەزانێ کە ئەو زاراوانە لە هەمـوو شوێنێك دا دەچن ، وەختی واش هەیە هەڵەی رێزمانیش دەکات لـــە گفتت و گۆ کردنە کەیدا ، بۆ نموونە ، لە جیاتی ئەوەی کـە بڵێت : ( دێمە باوەشت ) ، دەڵێت : ( دێمە باوەشم ) بوچی ؟؟ چونکە زۆر لـە دەم دایکیەوە ئەم رستەیە بیستووە •

ئایا منالّ ، تاوەکو سەر گفت و گۆکەی شکستە ئەبێ ؟؟!!

منالّ ، رۆژ بە رۆژ وە لەگەڵ گەورە بوونیدا مێشکی دەکرێتەوە و گەورە دەبێ و کون وقوژبن و کـەل و کـەلەبەری پـەرزو نـزمی زۆر تر دەبێ وە هەست چێژەکانی بە هێزتر دەبن ، وە رۆژ بە رۆژ زاڵترو قاڵتر دەبێ بە سەر زانینی بیری راستو چەوتدا ، لە بەر ئەوە

---

(8) Edward sapir; Language An Introduction to the study of Speech, New York, Harcourt, Brace and Company, 1921. OP.



منتدى إقرأ الثقافي

هەر کەگفتوگۆیەکی راست یا خود زاراوێکی راستی بیست ، دەست بەجێ هەڵەکەی خۆیی پێ راست دەکاتەوە •

ئایا لادێیەکی، نەخوێندەوار ئەو زمانە دەزانێ کە خوێندەوارێکی شاری دەیزانێ ؟؟!!!

بێ‌گومان لادێیە نەخوێندەوارەکەو شارییە خوێندەوارە کەش زمان دەزانن ، لادێیەکە لە زماندا هیچ کەمییەکی نیە جگە لە هەندێ زاراو نەبێ کە لەلای خوێندەواران باوەو بە کاری دەهێنن لە زمانی ئەدەب و زانستی هەمە جۆردا ، بۆ نموونە هەندێ زاراوی نوێ هەن ، کە لەلایەن ئەدیبانو خوێندەوارانەوە بەکار دەهێنرێن کەم کەمی ئاسایی لێیان تێ دەگات ، بەڵام ئەم زاراوانە بۆ پاشەرۆژ لەوانەن ببنە باو لە هەمو کونو قوژبنێکی کوردستاندا •

بە کورتی لەم سەر گوزەشتەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە منال : ـ

١ ـ ئەو شتە زوو فێر دەبێ یاخود ئەو گفت و گۆیە فێر دەبێ کە زۆر گوێی لێ دەبێ

٢ ـ ئەو گفت و گۆ و خوو رەوشتە فێر دەبێ کە زۆر باوە لە ناو ئەوخێزان و کۆمەڵەدا کە لە ناویدا دەژی •

٣ ـ ئەو شتانە فێر بوە ، کە بیستویەتیو بەکار هێنراوە لە بەر چاوییەوە و بەکاریشی هێناوە •

٤ ـ گۆ (تلفظ) و زرەی دەنگ (ئەکسنت = accent)ی بە تەواوی راستو رەوان دەبێ لەگەڵ گەورەبوونی هەموو ئەندامانی (تەن لەش)دا، وە بە تایبەتی ئەندامانی ئاخاوتن ، ئەگەر لە سروشتدا ، ناتەواو نەبن •

٥ ـ زمان فێر دەبێ بەبێ ئەوەی بیری لە رێزمانی زمان ، یا لە نووسین کردبێتەوە •



منتدى إقرأ الثقافي

٦ ـ ئەوەی کە زۆر گرنگ بێ ، لێرەدا ، ئەوەیە کە قسەی ڕێک‌و پێک بکرێت‌و گوێی لێ بگیرێت‌و هەستی بجوولێت‌و ببێتە هۆی ئەوەوە کە وەڵام بدرێتەوە •

ئەوەی کە زۆر روونە لە بابەت زمانەوە ، ئەوەیە کە زمان دەستکردێکی مرۆڤایەتی بە بێ بیر لێکردنەوە یە ، لە سەرەتاوە کەس خەریکی نەبوەو کەسیش هەندەسەی بۆ دانەناوە ، وەکو هەندێ وایان وتوە •

زمان ناسەکان ، هەر زۆر لە مێژەوە ، خەریکی ئەوە بوون کە ناوو نیشانێکی وای زمان هەڵدەن کە ئیتر پێویستی بە دەستکاری کردن نەبێ •

زمان ناسە یۆنانیەکان‌و رۆمانیە دێرینیەکان وایان دابویە قەڵەم ، کە زمان بریتیە لە وشە زانین ، بۆیە مامۆستاکانی ئەو سەردەمە دێرینە لە جیاتی ئەوەی کە زمان فێری قوتابیەکانیان بکەن ، وشەیان فێر دەکردن ، هەر وەها ڕێزمانی زمانی یۆنانی‌و رۆمانی کۆن ، بەشتێکی خواکردی وایان داناوە ، کە لە لای خواوە هەندەسەی دانراوەو نێرراوە ، و پێویستە ببێتە دەستوور بۆ هەموو جۆرە زمانێکی رۆژئاوایی •

هەر هەمان دەستوور ، لە زەمانی عارەبەکان‌و دەوری زێرینی ئیسلامیدا ، زمان ناسەکان وایان دەدایە قەڵەم ، کە گوایە زمانی عارەبی و ڕێزمانەکەی بۆ هەموو زمانە رۆژ هەڵاتیەکان دەشێ • ئەم جۆرە باسە نارەوایانە ، باو بوون تاوەکو زمان ناسی عارەبی بە ناوبانگ مامۆستا ( ئیبن خلدون ) نزیکەی ( ٦٠٠ ) ساڵێ لەمەوپێش وتی ! « زمان بریتیە لە ( مهارات ) واتا ( بیستن و قسەکردن‌و خوێندن‌ونووسین ) » ، وە ئەوەی بیەوێ فێری زمانێ ببێ پێویستە ، فێری ( مهارەکان ) ببێ •

ئێمە نابێ زمان ناسە سانسکریتیەکانمان لە بیرچێ کە نزیکەی



منتدى إقرأ الثقافي

(٢٥٠٠) ساڵێ لەمەو پێش باسی زمانی سانسکریتیی‌و کەرەسەیان کردوە ، وە یەکەم کەس بوون کە باسی دەنگ‌و دەنگ سازی زمانیان کردوە وە یەکەم سەرچاوە بوەکە زانستی زمانی لێوە هاتێتە دەرەوە ، مامۆستا پانینی = Panini بەم جۆرە ناوو نیشانی زمانی هەڵداوە : « زمان بریتیە لە یاسایەکی دەنگی ڕێك وپێك ، وە بۆ فێربوونی زمان پێویستە فێری یاسای دەنگی ببی ، ئەنجا ڕێزمان و شتی‌تر • »

نزیکەی سێ‌صەد صاڵ لەمەوپێش‌تر مامۆستا ( کامینەس = Camenius) ی چیکوسلوفاکی وتوویەتی : « زمان ئەوەیە ، کە بە زیندویی بەکار دەهێنرێت » :

زمان ناسە ڕۆژ ئاواییەکان کۆڵ بوون لە ناوو نیشان هەڵدانی زماندا ، تاوەکو نزیکەی صەد ساڵێ لەمەو پێش ، واتە سەردەمی مامۆستا ئەدوەرد سابیر (Edward Sapir) و دوکتور پاڵمە (Dr. Harold Palma) و پرۆفیسۆر ریچاردس (Richards Prof) ومامۆستا فریز ( Fries ) و یارمەتی‌دەری مامۆستا لادۆ ، ئەمانە هەر یەکەیان جۆرە ناوو نیشانێکی هەڵداوە وە بە چاوێکی خۆیی تەماشای زمانی کردوەو دیویەتی • لە راستی‌دا ، ناوو نیشانەکانی هەموویان بەشداری لەمەی خوارەوە دەکەن :

« زمان[٩] ، یاسایەکی دەنگی ڕێك‌و پێکە لە سەر شێوەی وشەی دەمی دەنگدار دەر دەچێ ، کە بەکار دێت لە میانەی دووکەس یا زیاتردا ، لە سەر بناغەی ئەوە کە خوویەکی مرۆڤایەتی کۆمەڵایەتی پێویستە لەگەڵ بەشدار بوونی هەست‌دا • »

---

(٩) مقدمة علم اللغة ـ الدكتور محمود السعران لە لاپەڕە (٥٨)دا بەم جۆرە ناوو نیشانی زمانی هەڵداوە : « زمان ئەوەیە کە ناوەڕۆکی بیری مرۆڤ بە وشەی دەنگداری دەمی دەر دەخات • »



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم ناوو نیشانەی سەرەوە ، ئەوەمان پیشان دەدات کە نەخشەی قسە کەرو قسە وەرگر بەم جۆرەی خوارەوە بکێشین :

| (١) قسەکەر |
| --- |
| بیر (حافز) > دەماغ > ئەمربەقسە کردن > قسەکردن |
| **(٢) قسەوەرگر** |
| باقـە بیر > دەماغ > ئەمربەقسە کردن > وەلأم دانەوە |

ئەم دوو نەخشەی سەرەوە سادەترین نەخشەن بۆ قسە کەرو قسە وەرگر : لە یەکەمدا ( بیر ) یا ( حافز ) دەچێت بـۆ مێشـك • ئـەمیش وەلأمی رێك دەخات وە ئەمر دەکا بە جیهازی ئاخاوتن کە وەلأمەکـە بە شێوەی دەنگی بنێرێتە دەرەوە ، وە هی دووەمیان دەنگەکان دەبیسێ‌و کاری تێ دەکات وە دەبێت بە هۆی ئەوەوە کە مێشك وەلأم رێك‌خات‌و ئەمر بکات بە جیهازی ئاخاوتن کە بە شێوەیەکی دەنگی رێك و پێك وەلأمی بداتەوە •

هەر وەکو لەوەوپێش وتمان ، هەر زمان ناسێ بە پێ‌ی دووربینی خۆی ناوو نیشانی زمان هەڵ ئەدا واتا هـەر کـەسێ بەپێ‌ی بسـپۆڕی خۆی لە لقێکی زانستی زماندا ، بۆ نموونە (دەنگ ساز = Phonetician) بەم جۆرەی خوارەوە زمـان لێك دەداتەوە : « زمـان بریتیە لە فۆنیم‌و مۆرفیم‌و سینتاکس »

مامۆستا محمد مبارك لەکتێبێ « فقـه اللغـة وخصائص العربيـة » چاپی ساڵی ١٩٦٤ ، لاپەڕە (٢)دا دەڵێت :

( فاللغة هي الجسر الذي يصل بين الحياة والفكر ، تسبق وجود الاشياء أحياناً وتلحقها أحياناً اخرى • ) •

مامۆستا ( تەوفیق وەهبی ) لە دەستووری زمـانی کوردی‌دا بـەم جۆرە ناوو نیشانی زمانی هەڵداوە : « زمان نیشاندانی بیرمانە ، بە یاریدەی کەلیمەوە ، زمان شتێکە ئەزبێژرێ‌و ئەشنووسرێ • »



منتدى إقرأ الثقافي

# ڕەسەنی زمانی کوردی

**A SHORT HISTORY OF KURDISH LANGUAGE**

زمانی کوردی ، یەکێکە لە خێزانە سەرەکی‌یەکانی هیندو ـ ئێرانی ، واتا زمانی هیندو ـ ئێرانی ، ئەبێ بە دوو بەشی سەرەکی‌یەوە بەشی هیندی ، وە بەشی ئێرانی ، بەشی ئێرانیش ئەبێ بە دوو شا بەشەوە ، لقی فارسی ، کە فارسەکان قسەیان پێ کردوەو پێ‌ی ئەکەن ، وە لقی میدی ، کە میدیەکان قسەیان پێ کردوەو زمانی کوردی ئێستاش نەوەی نوێ‌ی ئەون • بەم‌بۆنەیەوە

« مامۆستا پرۆفیسۆر مینورسکی دەڵێت » : (۱۰)

« یەکیەتی کوردەکان ، پێویستە لە سەر بناغەی مادی لێک بدرێتەوە » ✗

وە مامۆستا تەوفیق وەهبی دەڵێت : (۱۱)

« مادە هیندو ـ ئێرانیەکان کوردەکانی ئەمرۆن ، ئەگەر چی کوردە هیندو ـ ئێرانیەکان لە بنەڕەتدا ماد نەبن »

✗ئەو هۆزە هیندو ـ ئێرانیانە ، هەر وەکو مێژوو ناسەکان باسیان کردوە ، لەبانی ئاسیای ناوەڕاستەوە ( آسیا الصغری ) هاتوون • بەشی هیندی لە ئەفغانستانی ئەمڕۆوە بەرەو هیندستان ڕۆیشتوون ، وە بەشی ئێرانیش لە ئێرانو کوردستانی ئەمڕۆدا ژیاون ( فارسەکان لە بانی ڕۆژهەڵاتی ئێرانو ڕۆژ ئاوای جێگیر بوون ، وە میدیەکانیش ( کە کوردەکانی ئەمڕۆ نەوەی نوێ‌ی ئەوانن ) لە بانی سەرووی ئێرانی ئەمڕۆدا جێگیر بوون ) ✗•

---

(۱۰) گۆڤاری کۆڕی زانیاری‌کورد بەرگی یەکەم ۱۹۷۳ •
(۱۱) أصل الأكراد ولغتهم ـ توفيق وهبي •



منتدى إقرأ الثقافي

کورد ناسەکانی ئەم چەرخە ، کە وەکو زمان ناسەکـان و ئـەو رۆژهەڵاتناسانەی کە خوویان داوەتە ناسینی مێژوو و رەسەنی کوردو زمانەکەیان ، توانیان واتو ویتی هەندێ لەو ( رەحالە ) رۆژ ئاواییانـە بخەنە لاوە ، چونکە هەر کەسێ لەوانە بە خواشتەرخوازی خۆی کوردو رەسەنی کوردو زمانی کوردی بردبووەوە سەر رەگەزێ ، کـە خۆی مەبەستی بوو ؟ یەکێ دەیوت کوردەکان فارسن ، ئەوی تر دژی ئـەم رایە دەوەستاو رایەکی تری نالەباری لەمە نالەبارتر دەخستە روو ، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی ئارکیولۆژی یا مێژوویی یا هەر جۆرە بەڵـگەیەک کە تۆ پەسەندی بکەیت ، بە دەستیەوە بێ واتا ( حەماشانی ) •

بەڵێ ، راستە هەر وەکو وتمان ، کوردەکانو فارسەکان خزمن ، بەم بۆنەیەوە مامۆستا پرۆفیسۆر مینۆرسکی دەڵێت :(١٢)

« ئـەگەر کوردەکانو فارسـەکان برا نـەبن ئـامـۆزان • » ، وە میدیەکان بە باپیرە هەرەگەورەی کوردەکانی ئەمرۆ دەژمێررین هــەر زۆر لە مێژەوە شان بە شانی فارسەکان ژیاون (لەچەرخە دێرینیەکاندا) خاوەنی ئیمپراتوریەتێکی بە دەسەڵات وە خاوەنی شارستانیەتیو سامـان بوون ، لام وایە ئەم جۆرە شتانە روونبێ جگە لە مێژووناسـەکـان دانیان بەوەدا ناوە ، بەڵـگەی ئارکیولۆژی بڕوا پێکراویش هـەیـە ، وەختێ کـە ( سەلمناسر )ی سێیـەم شـای ئاشـور دەس دەکێشێ بـۆ میدیەکان ، لە نەقشو نقوشـەکانیـانا وا دەردەکـەوێ کـە میدیەکـان دوژمنیانن ، ئەم نەقشو نقووشە دۆزراوانە مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆسەر دەمی ( ٨٣٦ پ•ز )(١٣) • وە لـە هەندێ نـەقشو نقوشـی تـردا وا

(١٢) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ــ بەرگی یەکەم •
(١٣) کتاب ( تراث فارس ) (A.G. Arberry) ترجمة عربيـة من قبـل أسـاتذة كلية الآداب بجامعـة القاهرة « محمـد كفـاحي ــ أحمـد الساداتي ــ السيد يعقوب بكر ــ محمد صقرخفاجه ــ أحمد عيسى ــ ويحيى الخشاب ) •



منتدى إقرأ الثقافي

دەرکەوتوە کە میدیەکان توانیویانە ئاشوریەکان بخەنە ژێر سایەی خۆیانو پایتەختەکەیان ( نینوی ) داگیر بکەن ، لە سالی ( ٦١٢ پ ـ ز )[١٤] •

سەرچاوەی هەمە جۆر ، یەك کەوتوون لەوەدا کە ولاتی میدیەکان ، ئەو خاكو ئاوە بووە کە ئێستا کوردەکان تیا یا دەژین ، وە لە هەمان کاتدا وا دەگەینن کە خاوەن ئیمپراتۆریەتێکی بە دەسەلاتو گەورە بوون ، خاوەن سامان شارستانیەت بوون لەبەر ئەوە ، هەمیشە دوژمن دار بوون وە بە تایبەتی لە دەرەوەی سنووری ئیمپراتۆریەتەکەیان ( فارسەکان ، ئاشوریەکان ••• هتد )

ئاوێستا ، کە کتێبێکی ئاینی پیرۆزی زەردەشتە بە زمانی میدی وتراوەو نووسراوەتەوە ؟ هەر وەکو زوربەی سەرچاوەکان وا دەلێن ؛ چونکە زمانی میدی زمانی گەلەکانی ئێرانی ئەو سەردەمە بووە ئەمە لەلایەکەوە ، وە ( زەردەشت ) خۆی لەو ناوچەیەدا لەدایکبوە ، کە ئێستا پێی دەوترێ ( ئازەربایجانی ئێران ) ، وە ئەو سەردەمەش هیچ دەولەتێ نەبووە کە لەو ناوچانەدا بژی جگە لە دەولەتی میدیا ئەمە جگە لەوەی کە زۆر دوورە لە ولاتانی فارسی ئەو سەردەمەوە کە ( ئەکمینیان ) پێ دەوتن ، ( ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری (٧٠٠ سال پێش زایین ) ، وە وا دەدرێتە قەلەم کە ئاوێستا بۆ یەکەم جار نووسرابێتەوە ، لە زەمانی ( دارا )دا بووە ، وە نسخەیەك لەوە لە کۆشکی شا ( دارا ) دا دانراوە[١٥] • هەندێ لە ئاویستا ناسەکان دەلێن ئاوێستا بۆ یەکەم جار بە نووسینی مێخی نووسراوەتەوە ، وە

---

(١٤) هەمان سەرچاوە •

(١٥) تراث فارس ص ٤ ـ تألیف المستشرق ئەی جی ئەربەری الترجمة العربیة ( جماعة من أساتذة جامعة القاهرة ) •



منتدى إقرأ الثقافي

هەندێکی تریشیان دەڵێن بۆ یەکەم جار بە نووسینی ئارامی نووسراوەتەوە ، ئەوەی کە زۆر روونە نووسینی مێخی لە دەوروبەی (٤٠٠) پێش زایین‌دا کۆن بوەو باوی نەماوە ، وە نووسینی ئارامی بووە بە جێگەداری رەسمی ، بەڵام ئەگەر ئاوێستا لە زەمانی ( زەردەشت ) خوی‌دا نووسرابێتەوە دەبێ بە مێخی بووبێ ، ئەگەر واش نەبووبێ دەبێ بە نووسینی ئارامی نووسرابێتەوە ، وە هەندێکی تریش دەڵێن ، ئاوێستا بۆ یەکەم جار بە نووسینی ئارامی ( پیتی ئارامی ) نووسراوەتەوە لە دەوروبەری (١٠٠ زایین‌دا ) بوە •

ئەم دوو رایەی سەرەوە ، هەر وەکو هەردووکیان راست بن وایە ؛ چونکە ئەو بەشەی کە پێی‌ی دەڵێن ( گاتەز = Gaths) ، کە واتە پیرۆزەکانی ( زەردەشتی ) تێدایە دوور نیە کە لەو سەردەمەدا بە پیتی مێخی نەنووسرابێتەوە ، وە بەڵگەش بۆ ئەمە • ئەوەیە کە دەست کاریەکی وای پێوە دیار نیە کە شایەنی باس بێت ، ئەمە بە تەواوی ، بە پێچەوانەی بەشەکانی تری ئاوێستایە کە ( یەسنە = Yasna) و ( یسپرات = Vespprat) وە ( دێـوا = Devas) و ( وێندیداد = Vindidad) کە لە سەر سەر گوزە شتە وحەقایەت دەکەن ، وە لەوە دەکەن کە لە دەماو دەمەوە نووسرابنەوە ، بە شێوەیەکی روون‌تر موفرەداتەکانی ( گاتەز ) پارێزگاری بنەڕەتی‌یان کردوە بەڵام بەشەکانی تری ئاوێستا ، زوربەی موفرەداتەکانیان شێوەی بنەڕەتی‌یان ون کردوە چونکە بە دەماو دەم بوەو نووسینەوەیان زۆر دوا کەوتوە ، وە زوربەیان شێوەی فارسیان وەرگرتوە •(١٦) (١٧) (١٨)

---

تەماشای : (16) The Avestan Language, Soklov, Moscow.

(١٧) سروودەهای زرتشت ها (٣٠) م • ئاورنگ

(١٨) بررسی یسنا (١٠) م• ئاورنگ



منتدى إقرأ الثقافي

هەندێ رای تر هەن ، کە : ئاینی ( زەڕدەشت ) لە ناوچە شلخاویەکانی بانی ژووروی ئێران پەیدا بووەو زوربەی خەڵکی ئەو ناوچانەش بەبێ پەروا بەرەو ئاینی زەردەشتی چوون ، وە پیاوە ئاینیە تایبەتی‌یەکانیشیان لە بەریان کردوە ، وە لە پاش ئەوەی کە بووە بە ئاینی رەسمی لە زەمانی ( شا دارا )ی یەکەم نوسخەی زۆری لێ نووسراوەتەوە ( لە پێستی گادا . )[١٩] بەڵام وەختێ کە ئەسکەندەر هاتو دەستی کێشا بە سەر ئێراندا ، وە سەرکەوت بە سەر ( دارا )ی سێیەمدا ، هەرچی کتێبی ئاوێستا هەبوو سوتاندنی ، بە مەبەستی ئەوەی کە ئاینی زەڕدەشتی لە ناو بەرێت ، وە ئەگەر ئەو پیاوە ئاینیانە نەبوونایە ، کە ئاوێستایان لەبەرکردبو ، ئاینی زەڕدەشتی لە ناو چوو بوو .

لە کتێبی (Vandidad) ، کە لە لایەن (د. داود الجلبی الموصلی)وە وەرگێڕراوەتە سەر عارەبی ، دەڵێت : « ئاوێستا ، بۆ یەکەم جار بە زمانی ئاوێستی نووسراوەتەوە لە پاشا گۆڕراوە بۆ زمانی پالەوی . »

لێرەدا ، زمانی ئاوێستی ، مانای زمانی میدی ئەدات ، چونکە ئاوێستا لەو سەردەمەدا ، واتا لە سەردەمی باوی ئیمپراتۆریەتی میدیادا ، وتراوە .

لە کتێبی ، ( في التنبيه والأشراف ) مسعودی ص ٧٩ دار الصاوی بالقاهره ١٩٣٨مدا دەڵێت :

« ئەو نووسینەی کە ئاوێستای ، یەکەم جار ، پێی نووسراوەتەوە ، جۆرە نووسینێک بوە ، کە پێک هاتوە لە (٦٠) دەنگ و پیت ، وە ( زەڕدەشت ) لە پاش ئەوەی نوێی کردوونەتەوە ، ئاوێستای پێ نووسیوەتەوە ، بەم جۆرە نووسینەش دەوترێ ( دین بێرە ) واتا ( نووسینی ئاینی ) . »

---

(١٩) بڕوانە ( تراث فارس ) ئەی. جی. ئەربەری ( بالعربيه ) .



منتدى إقرأ الثقافي

من خۆم ، بەش بەحاڵی خۆم ، لەو باوەڕەدا نیم کـە هـەرچی ئاوێستا هـەبووبێ لە ناو چووبێ ، چ لـە زەمانی ئـەسکەندەردا ، کـە هەمووی سووتاندبێ ، یاخود لە ژێر سێبەری هەر یاسایەکی تردا ، چونکە هێز نی‌یە کە بتوانێ هەرچی کتێبی ئاوێستا هەیە ، لـە ناوی بەرێ وە بەتایبەتی لە پانیایی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەدا ، کـە هـەمـوو وڵاتانی گرتبێتەوە ، وە ئاینەکەش رەسمی بووبێ‌و بە رەسمیش نووسرابێتەوە ، جـا لـەبـەر ئـەوە ئـەگـەر پێـتـو نـاوچـە سـەختـەکـانی میدیـا (کـەشـمـاڵ ) بکـرێن ، زۆر شـتی کـۆن ؟ کـە وەکـو ئاوێسـتـا غەیری ئاوێستای ئەو سەردەمە دێرینیانە ئەدۆزرێنەوە وە بە تایبەتی لەو جێگایانەدا ، کە پێ‌یان دەوترێ نەزرگەی ( پیرەکلن ) واتا ( خـەلیفـە ئاینیەکان ) .

بە دووری مەزانە کە ئەو ئاوێستا دەسنووسەی کە ئێستـا وا لـە زانستگای کۆپنهاگن ، وە بە دەسنووسی میهرەبـان‌و کیخـسـرو )[20] ناوێك نووسراوەتەوە ، کـە لەبـەر دەسنووسـە کۆنـەکانـەوە وەری نەگرتبێ ، یا خود خوێ زۆر کۆن نەبێ ، ئەم (ئاوێستایە) بە بەنرخترین ئاوێستا دەژمێررێت ..

لە بەر فراوانی سنووری ئیمپراتۆریەتی میدیاو فرە بوونی دوژمنانی لە هەر چوار لای سنوورەوە ( لە رۆژ هەڵات دا ، فارسەکان ـ لە رۆژ ئاوادا ئاشوریەکان وبابلیەکان ...... ) دەولەتی میدیا لاواز دەبێ وە دەبێ بە جێگا تەماعی هەموو لایەك ، وە بە تایبەتی جێگا تەماعی فارسە خزمەکانیان ، لـە ساڵێ (٥٥٠) پێش زایین‌دا ، ( کۆرش ) توانی زاڵ

(20) Avestan Language, S.N. Soklov, Moscow



منتدى إقرأ الثقافي

بێ بەسەرشا ، ئێخ توویگو = Astyages) وە ئیمپراتۆریەتی میدیا بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە ، سەرانسەری دەس ڕۆیشتنی ئەمانە ، دەوڵەتەکەیان بە ناوی دەوڵەتی میدیەکانو فارسەکانەوە ناو نرابوو(٢١) ...

( سەیر ئەوەیە ، کە میدیەکانو هاخامەنشیەکان ، سەرانسەری حوکمرانیان پێکەوە دەژیان بەبێ ئەوەی دژاوەریەک لە نێوانیانا روو بدات ، کە شایەنی باس بێت ، هەرچی حوکم بەدەس هاخامەنشیەکانەوە دەبێ ، بەلاّم ئاینیان ، زەردەشتی دەبێ ، کتێبی ئاوێستا دەستووریان دەبێو زمانی ئاوێستاش زمانی رەسمی دەوڵەتەکەیان دەبێ ، ئەمە بە رای من ، لەوە ناکات کە هاخامەنشیەکان ، تیرەیەکی میدی نەبن ) •

زمانی میدیەکان دەکەوێتە کزی‌یەوە وە بەرەبەرە خۆی دەکێشێتەوە بۆ جێگا سەختەکانی میدیا کە دووروو پەناواکی بێ لە هۆرژمی دوژمنانەوە بۆ ئەوەی پارێزگاری ئاینە کەو کتێبە ئاینیە کە یان بکەن •

بێ گومان ئەو میدیانەی کە لە ناوچە شاخاویە سەختەکاندا ژیاون پارێزگاری ئاین و زمانیان کردووەو توانیویانە زمانەکەیان بە پاکی پارێزگاری بکەن(٢٢) ، وە ئە و ناوچانەی کە دەستی داگیر کەریان

---

(٢١) کتاب ( تراث فارس ) آ• ج• ئاربەری (AG. Arbervy) ص ٢٩ •

ئەم (و)ی (ئیزافەیە) کە هەیە لە نێوان ( میهرەبانو کێخسرو ) بە زاری هەورامیە چونکە لە هەورامی‌دا (و) بەکار دەهێنن لە جیاتی (ی) لە فارسی‌و کوردی‌دا •

(٢٢) گومانی تێدانیە ، شیعر ، یا خود فۆلکلۆر بە بێ ئەو ناوترێ واتا ، ئەگەر هۆیەک نەبێ هەستی شاعیر بجوولێنی ، شیعری پێ ناووترێ ، مامۆستا قانیعی خوا لێ‌خۆش بووش ، وا دەردەکەوێ کە مێژووی بەسەرهاتی کوردی زانیوە بۆیە ئەم شیعرانەی وتوە : =



منتدى إقرأ الثقافي

گەیشتوەتێ ، زمانەکەیان ئاڵوگۆڕ بوەو شێوەی زمانی داگیر کەری وەر گرتوە •

کزیو بێ وڵاتی کوردەکان بۆ چەند ساڵێك نەبوەو بڕێتەوە ، بەڵکو ، هەر وەکو مێژوو دەری دەخات ، ئەم دەسو ئەو دەس کەوتون لە هاخامەنشیەکانەوە ، بۆ ئاشکانیەکان ، لە ساڵی (٣٠٠پ•ز) ئەنجا ساسانیەکان ، لە دەوروبەری (٢٢٦) زایندا ، وە بەوجۆرە هەتاوەکو هاتنی ئیسلام و تا وەکو ئێستاش •

ئەگەر کوردەکان بۆ ماوەیەکی وا دووروو درێژ لە نەهاتا بووبن ، ئاخۆ زمانەکەیان چۆن ماوە ؟؟!

میدیەکان ، هەر وەکو ، هەتاوەکو سەر ، بەختەوەر نەبوون لە وڵاتو خاكو ئاودا ، هەر وەها لە زمانیشدا وا بوون ، بەپێی ئەوەی کە وڵاتانی میدیا بەش بەش بووە لە ناو یاسا سیاسیە داگیر کەرەکاندا ، زمانی هەر بەشەی وەکو شێوە زارێکی لێ هاتوە ، ئەوانەی لە ژێر دەستی فارسەکاندا ژیاون ، زمانەکەیان شێوەی زارێکی کوردی وەرگرتوە کە بەرەو فارسی دا دەتاشێ ، و پڕ بوە لە موفرەداتی فارسی ، وە بەو جۆرە ، وە ئەوانەش واتا ئەو میدیانەش کە دوور بوون لە ژێر دەستی داگیر

---

= شاخی هەورامان هەر چەند رەنجەڕۆم
زۆر چاك بزانە کە مەمنونی تۆم
چونکە پاراستت تۆ ئەو زمانە
تێکەڵت نەکرد لەگەڵ بێگانە
کتێبی زەردەشت ، کە ئاوێستایە
وەك باقی کتێب خەڵاتی خوایە
بە زوان هەورامی هاتە سەر بەشەر
یانی ها زەردەشت بوو بە پێغەمەر
ماریفەت و پیر وتەی شالیارە
کە پیر شالیار لە گشت دیارە



منتدى إقرأ الثقافي

کەرەوە ، ئەوا زمان و ئاین‌و رەوشتی باو باپیریان بە خاوێنی هێشتوەتەوە ، بەم جۆرە زاری کوردی هەمەچەشن پەیدابوو ، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هی وایان هەیە ، وا دەدرێتە قەڵەم کە زمانێکی تایبەتی‌یە و زارنیە •

بۆ زیاتر روون بوونەوە ، با تەماشای زاری ( رۆژی کوردستان ) بکەین ، کە ( غـەزەتـە = رۆژنامـە )ی سـەردەمی دام‌و دەستگـای ( شیخ محمود ) بووە ، لە ساڵێ (١٩٢٢)دا ، لە ژمارەی یەکەمی (١٥)ی تشرینی دووەمی ئەو ساڵە ، لە لاپەڕەی سێ‌یەمدا ، بەم ناوەو ە نوسراوە :

**« شفقت ملت نوازانه(٢٣)**

**له طرف ، هيئت محترمۀ رؤسای کوردستانەوه لو مقداره معاشـه که بو حضرت شوکت ماب ملك کوردستان قرار درا بوو عرض حضـور مبارك كرا لبر منافع عموميه و لبر اوه که خزينۀ ملت امرو شايستەی معاونت و همته ده هزار روپيه له طرف حضرت جلالت ملك کوردستانەوه بو خزينۀ مبارکۀ ملت اعادەو تبرع کرايەوه • »**

خوێندەواری خۆشەویست ئەگەر ورد ببێتەوە لە نووسینی کوردی ئێستەو ئەو زارەی کە پێی دەنووسرێ وە ئەوەی سەرەوەی غەزەتەکەی رۆژی کوردستان‌و زارەکەی ، ئەو وەختە ، دەزانی کە لە ماوەی (٥٠) ساڵێک‌دا چەند جیاوازی هەیە لە نێوانیانا ، ئاخۆ دەبێ ، چەند جیاوازی هەبێ لە میانەی زمانی ئاوێستاو کوردی ئێستـادا ، کـە مـاوەی نێـوان سەردەمیان بترە لە (٢٥٠٠) ساڵێ ، لەگەڵ ئەوەش‌دا ، ئەگەر تەماشای ئەو نەختە بەراوردە بکەیت ، کە نەختێ بەدواتر دەیبینی ، لـە نێوان زمانی ئاوێستاو زارە کۆنە کوردیەکان‌دا کراوە ، دەبینی زۆر کەم ترە ، لەو جیاوازیە فرەیەی کە هەیە لە نێوان ئینگلیزی کۆن‌و نوێ‌دا لە چاو

---

(٢٣) ئەم بەراوردە بە سێ مەقالە لە گۆڤاری بەیان ( ژ ١٠ـ١١ ، ١٣ )دا بەلاو کرایەوە •



منتدى إقرأ الثقافي

کەمی ماوەی نێوانیاندا ، تەماشای ئەم کورتە بەراوردەی نێوان ئینگلیزی کۆنو نوێیە بکە : (٤٢)

| ئینگلیزی کۆن | دەنگەکەی | ئینگلیزی نوێ | دەنگەکەی | واتاکەی |
|---|---|---|---|---|
| Libban | لیبەن | Live | لیف | دەژی |
| etan | ئیتەن | eat | ئیت | دەخوا |
| Fu'gol | فوگۆل | Fowl | فاوڵ | باڵندە |
| benc | بێنك | bench | بێنج | کەرەویتە |
| mete | مێتە | meat | میت | گۆشت |
| cild | کیلد | child | چایڵد | منداڵ |
| stan | ستان | stone | ستەون | بەرد |

هەروەکو لەمەو پێش وتمان ، زروفی سیاسی و ئابووری کۆمەڵایەتی ، دەساو دەس کەوتن‌و تەقاو ڕەقای زۆر بووە بە هۆی پەیدا بوونی زاری جۆر جۆر لە زمانی کوردیدا ، زمان ناسەکان ( زمانی کوردی ناسەکان ) هەر یەکە بە جۆرێ ، زارە کوردیەکانی دابەش کردوە بە سەر گرووپدا ، بۆ نموونە ، لیژنەی لێکۆڵینەوەی زمان لە کۆڕی زانیاری کورد دا ، بەم جۆرە ، گرووپە زارەکانی جیا کردوەتەوە :

١ ـ زارەکانی سەروو ( کرمانجی )

٢ ـ زارەکانی ناوەڕاست ( سۆرانی )

٣ ـ زارەکانی خواروو ( لوڕی‌وفەیلی ) •

(٢٤) تەماشای ئەم دێڕە شیعرەی ( بیوەف = Beowulf) بکە بزانە چەند جیاوازە لەگەڵ ئینگلیزیە وەرگێراوەکەی ئێستایدا :
خۆی : (Steap stanlitho - stige nearwe)
ماناکەی : (Steep stone - slopes, paths narrow)
لە ( English Literature, John Burgess Wilson. ) ، وە



منتدى إقرأ الثقافي

دەکەمال فوئاد ، لە ژمارە چواری (گۆڤاری زانیاری)دا بەم جۆرەی دابەش کردوە :

١ ـ زارەکانی رۆژ ئاوایی ( کرمانجی ژووروو )

٢ ـ زارەکانی رۆژهەڵاتی ( کرمانجی خواروو )

٣ ـ زارەکانی پاشووری

٤ ـ زارەکانی گۆرانی و زازایی

٥ ـ زارەکانی فەیلی

وە مامۆستا پرۆفیسۆر دە مەکەنزی بەم جۆرەی خوارەوە لێکۆڵینەوەی زارەکانی کردوە[٢٥] :

١ ـ کۆمەڵە زاری سولەیمانی ، کە بریتین لە : ( سولەیمانی )و ( وارماوا ) و ( بن گرد ) و ( پشدەر ) و ( موکری ) و ( ئەربیل)و ( رەواندز ) و ( خۆشناو ) .

٢ ـ زارەکانی عەقرە ، کە بریتین لە زارەکانی : ( عەقرە )و (عەمادیە)و بارواری ( ژوورو ) و ( گۆڵێ ) و (زاخۆ )و ( شێخان ) .

هەرچی چۆنێ بەتەوێ زارەکوردیەکان جویێ بکەیتەوە ، جویێ

---

(25) Kurdish Dialect Studies, Mackenzie. I.

مامۆستا ( شێخ محمدی خال )یش ، لە (ج) یەکەم ـ فەرهەنگی خاڵ ، بەم جۆرە جویێی کردوونەتەوە .

١ ـ زازا .

٢ ـ کرمانجی دەستە چەپ ( شمالی ) کە ( بۆتان ) و ( بادینان ) و ( هەکاری ) و ( بایزیدی ) و ( شەمدینانی ) .

٣ ـ کرمانجی دەستە ڕاست کە (سۆرانی) و ( بابانی ) و (موکریانی)و ( ئەردەڵانی )و ( کەلهوڕی )و ( گۆرانی )یە .

٤ ـ ( لوڕی )و ( بەختیاری ) و ( لەکی )و (فەیلی )یە .

مامۆستا ( ئەمین زکی بەگ ) ( لە مێژووی کوردو کوردستان )دا وە مامۆستا شەرەفخانی ( بتلیسی ) لە شەرەفنامەدا هەر یەکەیان بە جۆرێ دابەشیان کردوون .



منتدى إقرأ الثقافي

دەکرێنەوە ، بەڵام بەلای منەوە ، وەکو ئەوە نی‌یە ، کە چەند زارێک هەن لە زمانی کوردی‌دا ، ئەم زارانەش ، بە تەواوی وە لە هەموو شتێکدا ، وەک یەک نین ، واتا ناتوانین بڵێین ئەم زارە کوردیەو ئەوە ، لە هەموو روویەکەوە وەک یەکن ، جگە لە شتی بنەڕەتی ، چونکە ئەوەی کە ئێمە ناوی دەنێین زار یا چەند زارێک لە زمانێکدا ، مانای ئەوەیە کە ئەم زارانە لە سەریەک بنەڕەتن ( یەک رێزمان ، یەک قاڵبی تایبەتی رستە ، وە یەک یاسای دەنگی رێک وپێک ) •[٢٦]

ئەگەر مەرجێ لەم مەرجانەی سەرەوە لە زارێکدا نەبوو ، یا زارەکە لەو زمانە نی‌یە ، یا هۆیەکی تایبەتی هەبووە •

ئەو جیاوازیانەی کە هەبێ لە میانەی زارێکو یەکێکی تردا ، بە رای من تەنها لەم روانەی خوارەوەیە :

١ ـ هەڵەی رێزمانی ، ئەویش زوربەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆی شوێن کەوتنی قەوارەی رستەسازی زمانی بێگانەی تێکەڵاو بەو زارە ، سا بە هەرجی چۆنی بێ •

٢ ـ پەیدا بوونی هەندێ دەنگێ لە زارێکدا کە لەوانی تردا نی‌یە ، ئەویش ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەقاو رەقایانە ، کە لەوەو پێش هەندێکیمان باس کردوە •

٣ ـ پەیدا بوونی موفرەداتی بێگانە ، یا روو بەزمانی بێگانەیەکو زۆر جیاواز لەو موفرەداتە بێگانانە کە هەن لە زارەکانی تردا ، ئەمەش دەگەڕێتەوە ، هەر وەکو وتمان بۆ بوونی هەر بەشێکی کوردستان لە ژێر یاسایەکی سیاسی جیاوازدا •

---

(٢٦) مامۆستا پرۆفیسۆر مینورسکی لە گۆڤاری کوڕی زانیاری کورد • بەرگی یەکەم دەڵێت :
«شتێکی زۆر گرنگ هەیە ، کە دەلالەت لە یەکیەتی زارە کوردیەکان و کوردەکان دەکات ؛ ئەویش (رێزمانەکەو یاسا دەنگی‌یەکەیەتی)» •



منتدى إقرأ الثقافي

ئەوەی کە زۆر گرنگ بێ لای من ، ئەوەیە کـە ئایا ئـەم زارە کوردیانە بە تێکڕایی دەچنەوە سەر زمانی ئاوێستا ، یـا خـود زمـانی میدی ؟!!!

ئەگەر وەڵام ، بەڵێ بێ ، ئەوا زمانی کوردی نەوەی نوێی زمانی ( ئاوێستی = میدی )یە ، وە مێژوویەکی نەبچڕاوی زمانی کوردی و نەتەوەکەش ڕۆشن کراوەتەوە •

لام وایە ، زۆر کەس لەگەڵمایە ، ئەگەر بڵێم مانەوەی زمـــان بەستراوە ، بەم شتانەی خوارەوە :

١ ـ یاسای سیاسیو چۆنیەتی یاساکەو سروشتی وڵاتەکە •

٢ ـ رادەی زانستیی ئەدەب و فەن •

٣ ـ ئاین و ئاین پەروەرەکان و رادەی زانیاریان و پەڕاویئاینی •

٤ ـ رادەی زانیاری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری ئەو کەسانە ، کـە ئەو زمانەیان بەکار هێناوە •

٥ ـ رادەی زیندویەتی زمان •

من تەنها لە دوو نوختەوە دەگەڕێم بـە شوێن زمـانی کـوردی و بنەڕەتیدا ، کە ئەوانیش ئەمانەن :(٢٧)

١ ـ هێنی ئاینی ، ئەویش ئەوەیە کە ئاوێستا بە زمانی میدی وتراوە و نووسراوەتەوە ، هەرچی هەندێ لە داگیرکەران گەڕاون بەشوێنیدا ، بۆ لەناوبردنی ، بەڵام هەر بەشی ئەوە پەنا دراوە ، کە ڕێچکەی مێژووی زمان روون بکاتەوە •

---

(٢٧) گومانی تێدانیە ، کە نەقشو نقوشی نەسەری زۆر گـرنگـە لـەم رووەوە ، ئەگەر خۆی بدات بە دەستەوە •



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ هینی سروشتی ، که ئەمیش ، ئەگەر لە هۆی پێشوو تر گرنگ تر نەبێ کەم تر نی‌یە ، وە هەر وەکو لەمەوپێش و تمان ئەو میدیانەی کە لـە ناوچـە شاخاویەسەختەکاندا ژیـاون‌و دەستی داگــیر کـەریـان نەگەیشتوەتێ ، توانیویانە پارێزگاری سێ شتی گرنگ بکەن :

أ ـ زمانی ( ئاوێستی = میدی ) ، هەندێ کە لەپووری فۆلکلۆری و اسطوری‌و مەلحەمی •

ب ـ شتی ئاینی ، کـە وەکو وتـە پـیروزەکـانی زەردەشت کـە ( گاتەز )ە •

حـ ـ هەندێ سروودو دۆعاو خوو ورەوشتی ئاینی زەردەشتی ، وە بەتایبەتی لای ( پیر = خـەلیفـە ) کـانی زەردەشــت ، کـە ئـەرکی سەرشانیان بوە ، کە زور بەی تەعالیمی ئاینی لـە بەرکەن و پارێزگـاری پەرسش‌گاکان بکەن و بە پێی وتە کانی زەردەشت برون بە رێوە •

بۆ ئەوەی رێگای دلنیایمان نەختێ روشن‌تر بێ ، وای بـە باشتر دەزانم پەنا بەرینە لێکۆلینەوەی بـە راوردی نێوان زارە کوردیەکـان و زمانی ئاوێستا ، وە لەبەر ئەوەی کە ئەمە باسێکی زۆر قـوول و درێژە وا لێرەدا کورتەیەکی ئەم بەراوردەیە پیشان ئەدەین •



منتدى إقرأ الثقافي

# لێکۆڵینەوەی بەراوردی[٢٨]

لەم لێکۆڵینەوەدا ، سێ روو وەر دەگرین •

١ ـ رووی ( دەنگ سازی = فۆنۆلۆژی ) •

٢ ـ رووی ( وشەسازی = مۆرفۆلۆژی ) •

٣ ـ رووی ( سینتاکس = رستەسازی )

بێ گومان ، هەمومان دەزانین کە زمانی ئاوێستا زمانێکی مردوە ، واتا ئێستە هیچ کۆمەڵێك نیە کە بە زمانی ئاوێستا قسە بکەن ، وە ئەوانەش کە دەزانن زمانی ئاوێستا بخوێننەوە ، هۆی زیندو کردنەوەی یاسا فۆنەتیکیەکەیەتی کە لە لایەن زمان ناسەکانەوە رۆشن کراوەتەوە وە گومانیشی تێدانیە ، کە ( ئاوێستا نووسەر ) لە هەر کاتو ساتێکا بووبێ ، هەڵەی رێزمانیو هەڵەی دەنگی کردوە ، هەر وەها بە دووری مەزانە کە دووبارە کرابنەوە و زۆر تریش کرابن لەکاتی ئاڵو گۆڕی وەرگێران و ترانسلیترەیشنەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی‌تر •

### ١ ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی لە فۆنۆلۆژیدا[٢٩]

ئەوەی کە لێرەدا باسی دەکەین ئەوەیە کە دەنگەکانی زمانی ئاوێستا دەهێنین و یەکە یەکە لە گەڵ دەنگەکانی زمانی‌کوردی ئێستادا بەراوردیان

---

(٢٨) بۆ ئەم لێکۆلینەوە ، بە نیسبەت زمانی ئاوێستاوە تەنها دوو سەرچاوەمان هەن ، سەرچاوەی فارسی کە بریتین لە ( گزارش گاتاها ) سروودهای زرتشت ها٣٠نوشتە م٠أورنگ ، گزارش بهرامیشت و بررسی یسنا ٩ ، ١٠ وە سەرچاوەی ئینگلیزی کە بریتیە لە : The Avestan Language, S.N. Sokolov, Moscow

تەنها ئەو شتانە وەرگیراون ، بۆ بەراورد کردن لەگەڵ زارە کوردیەکاندا ، کە لە هەر دووسەر چاوەکەدا وەك یەکن ، وە ئەم بەراوردەش بەزۆری لە رووی لەیەکچوونەوە کراوە •

(٢٩) لە گۆڤاری بەیان ژمارە (١٣)دا ، ئەمە بەلاو کرایەوە



منتدى إقرأ الثقافي

دەکەین ، بۆ ئەوەی چە لێکچوون و جیاوازیەک هەبێ لە نێوانیانا دەس نیشانیان بکەین :

## ٢ ـ دەنگە بزوتێنەکان (Vowels)

**دەنگی / a / :**

ئەم دەنگە ، کورتە وەکو سەری عارەبی وایە ، وە لە زارە کوردیەکانیش‌دا ، ئەم جۆرە دەنگە زۆر زۆرە ، نموونەی لە ئاوێستادا وەکو /hapta/ ، کە گۆکەی ( هەبتە ) یە ، وە مانای ( حەوت ) دەدات ، وە نموونەی ئەم دەنگە لە کوردی‌دا وەکو ( وەرە ) ، (دەرەوە)•

**دەنگی / ā / :**

ئەم دەنگە ، بزوێنێکی درێژە ، وەکو ئەو دەنگە وایە کەوا لە وشەی ( ئاو )دا ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو / āp / ، کە گۆکەی ( ئاب )ە وە مانای ( ئاو ) دەدات ، رەمزی فۆنەتیکی ، بەم جۆرە ، / اَ / دراوەتێ • ئەم دەنگە لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکی‌تر دەگۆڕێ ، واتا بە پێی جێگا ، کورت دەبێ و قەڵەو دەبێ درێژیش دەبێ •

**دەنگی / i / :**

ئەم دەنگە ، وەکو ژێرێکی عارەبی وایە ، وە نموونەشی لە زمانی ئاوێستا • وەک ، / zi - zan / کە گۆکەی ( زیزەن )ە و ماناکەشی ( زاین )ە ، ئەم جۆرە دەنگە زۆر زۆرە لە زمانی کوردی‌دا ، وە پێی دەوترێ کورتە دەنگی / ی / ، وە نموونەشی لە کوردی‌دا وەکو ( کردی ) ، ( خواردی ) •••

**دەنگی / ī / :**

ئەم دەنگە ، زۆر درێژەو گیرە ، وە نموونەشی لەزمانی ئاوێستادا وەکو / gī-ti / کە گۆکەی ( جیتی = گیتی ، ژیتی ) ، کە مانای ( جیان =



منتدى إقرأ الثقافي

ژیـان ) دەدات وە نموونەشی لــە کوردیدا ، وەکو ئەوەی لــە وشــەی ( پیر ) و ( شیر ) دایە •

**دەنگی / u / :**

ئەم دەنگە ، وەکو کورتە بۆری عارەبی وایە ، وە نموونەش بــۆ ئەمە لە ئاوێستادا وەکو / äsuş / ، کە گۆکەی ( ئازۆش ) = ئازوش )ە وە مانای ( ئازا ) دەدات وە لە زمانی کوردیدا نموونەی زۆرە وەکو ئەو دەنگەی کە لەم وشانەدا هەیە ( کورد ) ، ( کورت ) ئــەم دەنــگە بــە پێی جێگای لە وشەدا دەنگ دەدات واتــا ئــەگەر جێگـاکــەی گــۆڕا دەنگەکەشی دەگۆڕێ •

**دەنگی / ü / :**

ئەم دەنگە لەوەی پێشوو زۆر درێژترە ، وە نموونەی لە ئاوێستادا ، وەك / tanü / کە گۆکەی ( تەنوو )ە کــە مـانای ( تــەن = لەش ) دەدات ، وە نموونەی لە کوردی دا وەك ( چوو ) ، ( شوو ) •••

**نیمچە بزوێنەکان** (sonants)

ئاوێستا ناســەکــان زیـاتر لــە دوو دەنگیـان دانـاوە لــە ریــزی (semi vowel = sonants) دا ، ئەمانــە ئێستەش لــە زمـانی کوردیدا ، هەندێکیان نەرمن لە گۆ کردندا ، بە (semi - vowel) دەدرێنە قەڵەم ، بــەڵام فۆنیمی / m / ، / n / ، / r / لــە بــەکـارهێنـانی ئێستایـاندا کۆنسۆنانتن نیمچە بزوێن نین •

**دەنگی / y / :**

ئــەم دەنگە ، دەنــگی / ی / ی ســەرەتایە ، وە نمــوونــەشی لــە ئاوێستادا ، وەك / yaşta / کە گۆکــەی ( یەشتە ) یــە ، وە مــانـای ( پەرستش )ە ، وە نموونەی لە کوردیدا وەك ئەو دەنگەی کــە لــە وشەی ( یانە ) دایە •



منتدى إقرأ الثقافي

**دەنگی / ɪ / :**

ئەم دەنگە ، دەنگی / ف /یە ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکـو / vrkas / ٥ ، کە گۆکەی ( فرگە )یە وە مانای ( وەرگ ) بـە زاری ( هەورامی ) وە ( گورك ) بـە زاری ( سۆرانی ) دەدات ؛ ئێستەش لـە زاری هەورامی‌دا ؛ لە کاتی گۆ کردنی هەندێ وشەی دەس‌پێ‌کراو بـە دەنگی / و / ، یا خود / ف / تێکەڵاو دەکرێن بە یەکتری ؛ بۆ نموونە ، ئەم وشەی / بەفر /ە ، بە ( وەروە ) ، وە ( فەرفە ) ، گۆ ، دەکەن •

**دەنگی / r / :**

ئەمە زۆر کەم دەنگەو نەرمە ، لە لای ئاوێستا ناسەکانەوە هـەر بە نیمچەبزوێن دانراوە ، ئەمەش بە پێی گۆڕانی جێگای ، دەنگەکەشـی دەگۆڕێ ، نموونەی لە ئاوێستادا وەك / zrdā / کـە گۆکـەی ( زردا )یە وە وەکو ئەو دەنگە وایە کە وا لە کۆتایی وشەی ( هەنار )ەوە •

**دەنگی / n / :**

ئەم دەنگەش ، هـەندێ جـار بـە نیمچە بزوێن دانراوە چونکـە جێگاکەی وابوە کـە زۆر بەنزمی‌و شـارراوەیی گـۆ بکرێت ، وە زۆر جاریش بە کۆنسونانت ژمێرراوە چونکە گۆکەی ئاشکراو گـیر بووە ، نموونەی لە ئاوێستادا وەکو / nāma / ، کە گۆکەی ( نـام ) یـاخـود ( نامە ) وە مانای ( ناو ) دەدات ؛ ( بە زاری هەورامی ) •

**دەنگی / m / :**

ئەم دەنگەش ، هەر لەبەر ئەوەی کە لە جێگای جیـاواز جیـاوازدا هەمە جۆر دەنگی داوە ، ( لە بەر ئەوە لە هەندێ جێگادا ، کە شارراوەو دەرنەکەوتوو بووە ) پێیان وتوە (Sonant) ، وە لـە هەندێ جێگـادا ، ئاشکراو گیر بووە ، پێیان وتوە کۆنسونانت • نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو



منتدى إقرأ الثقافي

/satam/ ، کە گۆکەی ( صەتەم )ە وە ماناى ( صەد = ١٠٠ ) دەدات ، وە نموونەشی لە کوردیدا زۆر زۆرە •

ب ـ دنگە بزوێنە لۆدارەکان (diphthongs)

ئەو بزوێنە لۆ دارانەی کە لە ئاوێستادا بەکار دەهێنرێن ، لە زارە کوردییەکانی ئەمرۆدا بەکار دەهێنرێن ، وە بە بێ زیادو کەمی :

**دەنگی / āi / :**

ئەم دەنگە تێهەڵکێشراوە ( لۆدار ) زۆر زۆرە لە زمانی کوردی ئێستادا ، وە نموونەشی وەك ئەوەی کە لەم وشانەدا دەیبینی : ( دەی ) ، ( کەی ) ، ( وەی ) •

**دەنگی / au / :**

ئەمەش ، دوو لۆیە ، وە نموونەشی لە کوردیی نوێدا وەك ( کەوت ) ، ( چەوت ) ، ( نەوت ) •

**دەنگی / āi / :**

ئەمەش ، دوو لۆیە ، وە نموونەشی لە کوردی نوێدا ، وەکو ئەوەی کە لە وشەی ( ئای ) ( نای ) ، ( دای ) دایە •

**دەنگی / āu / :**

ئەم جۆرە دەنگەش لە کوردی نوێدا ، زۆرە وەك ئەوەی کە لەوشەی ( ناو ) ، ( ئاو ) ( راو ) دایە •

ج ـ دەنگە کۆنسونانتەکان = Consonants

ئەو دەنگە کۆنسوناتانەی کە لە زمانی ئاوێستادا بەکار هاتوون ، ئێستەش هەنو لە زارە کوردیەکاندا بەکار دەهێنرێن ، لەگەڵ لە ناوچوونی یەك دوو دەنگێ لە هەندێ زاری کوردیدا ، وە مانەوەی ئەوانە لە زارێکی تردا ، بۆ نموونە دەنگی / θ / ، کە دەنگەکەی



منتدى إقرأ الثقافي

/ث/یە ، لە زاری هەورامی هەورامانی تەخت دا ماوە بەڵام لە زارە کوردیەکانی تردا نەماوە ، نموونەشی لە هەورامی‌دا وەکو ( ثەرە ) ، کە ئێستە بە نووسین ( سەرە ) دەنووسرێ •

زمانی کوردی ، هەر وەکو هەندێ دەنگە کۆنسوناتێکی ون کردوە ، هەندێ دەنگیشی تێکەڵ بووە ؛ وەك دەنگەکانی /ق/ ، /غ/ ، /ص/ •

وە نموونەشمان بۆ ئەم دەنگانەی سەرەوە زۆر زۆرە لە گفت و گۆدا •••

دەنگە کۆنسوناتەکانی زمانی ئاوێستا ئەمانەن :

**دەنگی / k / :** (۳۰)

ئەم دەنگە دەنگی /ك/یە ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو / Kana / کە گۆکەی ( کەنە )یە وە ئێستەش بە هەورامی هەر هەمان وشە بەکار دەهێنرێ لە جیاتی ( هەڵکەنە ، (۳۱) هەڵکەندن ) بە زاری سۆرانی •

**دەنگی / J / :**

ئەم دەنگە دەنگی /ج/ یە ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو لەم وشەدایە /ham-jamaram/ ، کە گۆکەی ( هەم جەمەن )ە وە مانای ( ئەنجومەن )ە ، وە لە کوردی ئێستەش‌دا نموونەی ئەم‌دەنگەمان زۆرە •

---

(۳۰) هەر یەکە لەم کۆنسونانتانە فۆنیمێکە ( واتا چەند دەنێکی هەمە جۆری هەیە لە جێگای جیاواز جیاوازدا •

ئاوێستادا نزیکەی سێ جۆرە دەنگی / K / هەیە بەڵام ، من

(۳۱) هێشتا بۆم روون نەبوەتەوە کە کامیان رەقە وە کامیان نەرمە واتا ( کامیان دەنگی / ق /یە وە کامیان دەنگی / ك /یە ) ، ئەمە جگە لەوەی کە پیتی ( Q ) ش هەیە و بەکار هاتوە لە جیاتی چەند دەنگێك •



منتدى إقرأ الثقافي

دەنگی / x / :

ئەم دەنگی /خ/ە ، نموونـەشی لـە ئاوێستـادا وەکـو / xşap / کە گۆکەی ( خشەب ) یا ( خشەپ )ە وە مـانـای ( شـەو ) دەدات ، نموونەی ئەم دەنگەش لە کوردی دا وەك (خورما) ، (خوری) ...

دەنگی / G / :

ئەمە دەنگی /گ/یە ،وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو / garmah / کە گۆکەی ( گەرمە ) و واتای ( گەرم ) دەدات ،وە نموونەی ئەم دەنگی /گ/ یە ئێجگار زۆرە لە زمانی کوردی‌دا .

دەنگی / Ç / :

ئەمە دەنگی /چ/یە ، وەنموونەشی لـە ئاوێستادا وەکـو ئـەوەی کەلەم وشەدا هەیە : / haçati / کە گۆکەی ( هەچەتێ ) واتا ( ئەوبێ عەقلە ) ، یا خود لەم وشەدا ، (Sçandayati) کە گۆکەی ( شکاندیەتی ) دەدات ، وە نموونەی ئەم دەنگەش لە کوردی‌دا زۆرە ، وەك ( چـاو ) ( چرا ) ، ( چریکە ) .

دەنگی / Ş / :

ئەم دەنگە دەنگی /ش/یە ، وە نموونەشـی لـە ئاوێستـادا وەك / nişad / ، کە گۆکەی ( نیشەد )ە . یـاخـود بـە زاری هـەورامی ( نیشەرە ) وە سۆرانی ( دانیشە ) .

دەنگی / Ž / :

ئەم دەنگە /ژ/یە ، وە نموونەی لـە ئاوێستـادا وەك / mizda / کەگۆکەی ( مژدە )یە وە ماناکەشی هەر ( مژدە )یە .

دەنگی / t / :

ئەم دەنگە /ت/یە ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا وەکو / brāta / کە گۆکەی ( براتە )یە ، وە مانای ( برا ) دەدات .



منتدى إقرأ الثقافي

دەنگی / θ / :

ئەم دەنگە /ث/یە ، لە زاری هەورامی‌دا ماوە نموونەشی لە ئاوێستادا وەک ئەوەی کە لە وشەی / mrθuş / دا هەیە ، کە گۆکەی ( مرثوش )ە کە مانای ( مردن ) دەدات •

دەنگی / b / .

ئەم دەنگە ، /ب/یە و نموونەشی لە زمانی ئاوێستادا وەک / brzant / ە ، کە گۆکەی ( برزەنت ) ، یاخود ( بەرزەن )ە ، کە مانای ( بەرز ) دەدات •

دەنگی / d / :

ئەمە دەنگی /د/ یە ، وە نموونەشی لە ئاوێستادا ، وەک / dasa / کە گۆکەی ( دەسە )یە ، وە بە هەورامی مانای ( دە )ی سۆرانی دەدات ( دەسەیی گوێز = دەگوێز ) •

دەنگی / S / : (٣٢)

ئەم دەنگە /س/یە ، نموونەی لە ئاوێستادا وەک / star / کە گۆ کەی ( ستار )ە وە مانای ئەستێرە دەدات ئێستەش ئەم وشەیە ، بەهەمان مانا لە لایەن شاعیرە کوردەکانەوە بە کار هێنراوە ، وەک ئەمەی حاجی قادری کۆیی لە ( وتم بە بەختی خەواڵوو )دا :

« لە گۆمە شینی کە قازو مراوی دێن و دەچن

نەظیری مانگ‌و ( ستارەن )لە قەڵزەمی مینا • »

---

(٣٢) لە ئاوێستادا ، زیاتر لە سێ دەنگی / S / مان هەیە ، ئیتر لام روون نی‌یە کە کامیان قەڵەوترە لە گۆ کردن و دەنگ‌دا لەوی تریان ، لاشم وایە کە دەنگی / ص / و / س /یان تێدا بێ بەڵام چونکە لە زمانی ئینگلیزی و لاتینی‌دا رەمزی / ص / نی‌یە ، لە بەر ئەوە ئەگەر لە ئاوێستادا هەبووبێ ، دەر ناکەوێ •



منتدى إقرأ الثقافي

دەنگی / Z / :

ئەم دەنگە / ز /یە ، وە نموونەی لە ئاوێستادا وەکو / zrd / کە گۆکەی ( زرد )ە وە مانای ( زار ) یا خود ( دڵ ) دەدات(٣٣) .

دەنگی / P / :

ئەم دەنگە /پ/یە ، و نموونەی لە ئاوێستادا وەکو / pança / کە گۆکەی ( پەنچە )یە ، وە مانای ( پێنج ) دەدات .

دەنگی / F / :

ئەم دەنگە /ف/یە ، نموونەی لە ئاوێستادا وەکو / draf şah / کە گۆکەی ( درەفشە )یە وە بە زاری هەورامی ( درەوشێۆ ) واتا ( دەشەکێتەوە ) .

دەنگی / h / :

ئەم دەنگە /ھ/یە ، وە نموونەی لە ئاوێستادا وەکو / hapta / کە گۆکەی ( هەپتە )یە ، وە مانای ( هەفت ) یاخود ( حەوت ) دەدات .

٢ ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی لە مۆرفۆلۆژیدا

لەم بەشەدا ، تەقالا دەدەین کە چەند وشەیەك و موفرە داتێکی زیندووی ئاوێستا بەراورد بکەین لەگەڵ هینی کوردیدا .

ا ـ ژمـاره :

١ ـ / al-va / : ئەمە گۆکەی ( ئیڤە )یە ، بە هەوارمی ( یۆڤە ) یاخود ( یۆوە )یە کە مانای ( یەك ) دەدات .

---

(٣٣) ئێستە ، وە لە هەندێ ناوچەدا ( زار ) بە مانای ( دەم ) بەکار دەهێنرێت ، لاشم وایە کە هەمان وشە وە بە مانای ( زار ) لە هەندێ ناوچەدا بەکار بهێنرێت .



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ / dva / : ئەمە گۆکەی ( دڤە ) یە بە هـەورامی دۆڤێ ، یاخو ( دوێ ) ، کە مانای ( دوو )ە •

٣ ـ / tri / : ئەمە گۆکەی (تری)یە، وە ئێستەش بە ئینگلیزی پێی دەڵێن ( ثری ) ، وەلام وایە لە بنەڕەتدا ( جارمانی ) کۆنە •

٤ ـ / çatvär / :

/ çaθvär / ئەمە ، گۆکەی ( چزڤار )ە وە مانای ( چوار ) دەبەخشێ •

٥ ـ / panç / ، ئەمـە گۆکـەی ( پەنجە )یـە ، وە مـانای ( پێنج ) دەدات •

٦ ـ / xşvaş / : ئەمە گۆکەی ( خشفەش ) یاخود (شوفەش) کە مانای ( شەش ) دەدات •

٧ ـ / hapta / : ئەمە گۆکەی ( حەپتە )یە ، کە مانای (حەفتە) یاخود ( حەوت ) دەدات •

٨ ـ / aşta / : ئەمە گۆکەی ( ئەشتە )یە ، کە مانای هـەشت دەدات •

٩ ـ / nava / : ئەمە گۆکەی ( نەڤە )یە وە مانای ( نۆ ) یاخود ( نوێ ) دەدات •

١٠ ـ / dasa / : ئەمە گۆکەی ( دەسە )یە ، کە مانای ( دە ) دەدات •

ب ـ موفرەدات (Vocabularies) (٣٤)

١ ـ / päd / : کە گۆکـەی / پـاد /ە ، وە مـانـای ( پا )ی هەورامی دەدات ، وە بە سۆرانی ( پێ )یە ، وەئەم ناوە لە ریزی (ناوی) نێر دایە ، هەر وەکو لە هەورامی‌دا وایە •

---

(٣٤) ئەمانە ، هەر رەگەکەیانە ( root ) .



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ / äp / : گۆکەی / ئاپ /ە کە مانای ( ئاو ) دەدات ، لە ریزی ناوی ( مێ )یە ، هەر وەکو لە هەورامیدا وایە •

٣ ـ / gäv / : گۆکەی / گاف /ە ، کە بە هەورامیش ( گاف ) یا ( گاو )ە ، لە ریزی ناوی ( نێرو مێ‌یە )

٤ ـ / barz / : گۆکەی ( بەرز )ە وە مانای ( بەرز ) دەدات ، ئاوەڵناوە •

٥ ـ /mäh / : ئەمە گۆکەی ( ماە ) ، وە مانای مانگ دەدات ، لە رێزی ناوی ( نێر )دایە •

٦ ـ / xşap / : ئەمە گۆکەی ( خشەب ) یاخود ( شەب )ە ، بە فارسی ئێستەش بەکار دەهێنرێت بۆ هەمان مانا ، لە ریزی ناوی( مێ )یە •

٧ ـ / padä / : ئەمە گۆکەی ( پادا )یەوە بە هەورامی ئێستەش وشەی ( پادار ) بەکار دەهێنرێت بۆ مانای ( خێرا لە رۆیشتندا ) ، بەڵام دەنگی / د /کەی[٣٥] لەودی سولەیمانی و هەورامانە ، لەوەی ( هەولێر )نی‌یە •

ح ـ پاشبەندی / a / ە ، لە ناوی ( نێر )دا وە / ä / لە( مێ )دا ، وەك :

/ asp-ä / کە گۆکەی(*) ( ئەسپا )یە ، وە مانای ماین دەدات •

/ dain-ä / ، گۆکەی ( دەینا ) کە مانای ( ئایین ) دەدات ، کەوا بو وشەی ( دین ) عارەبی نیە بەڵکو ( ئاوێستیە ) ، لێرەشدا وشەی ( دەینا ) لە ریزی ( مێ )دا ژمێرراوە •

/ sur-ä / ، گۆکەی ( زۆرا ) وە مانای ( زۆر ) دەدات ، وە

---

(٣٥) رەمزی ئەم جۆرە دەنگەمان بەم جۆرە / : د / داناوە •
(*) / asp-a / ئەسپە واتای ئەسپ ئەدات •



منتدى إقرأ الثقافي

ئەمیش لە ریزی ( مێ )دایە • هەروەها ئەم باش بەندەش / ī / بۆ مێ بەکار دەهێنرێت وەك :

/ bum - ī / کە گۆکەی ( بومی )ە وە بە هەورامی ئێستەش بە ( زەوی ) دەڵێن ( بووم ) واتا ( زەوەی ) •

**پاشبەندی** / tara — / ، کە گۆکەی ( تەرە ) یاخود ( ترە ) بەکار دەهێنرێت بۆ بەراورد کردنی ئاوەڵناو وەك بڵێیت : ( خراپ ) ( خراپتر )ە ، وەکو :

/aka/ = /aka-tara/ کە گۆکەیان : ( ئەخە ) ( ئەخەترە ) واتا ، ( خراپە ) زۆر ( خراپترە ) •

**د ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی لە سینتاکس‌دا •**

لێرە ئەم چەند رستەیە بەراورد دەکەین و بزانە چەئاڵو گۆڕێك بوە لەم ماوە فراوانەدا :

| | |
|---|---|
| ( ـ پێم دا ) = ( داد مەیێ ) = | 1 - DA-D-MAHI |
| ( پێی‌دا ) = ( دەداتێ ) = | 2 - DA-DA-TI |
| ( دەزێ ) = ( زنە تا ) = | 3 - ZNA - TA |
| ( لە دایك بوون ) = ( زیزەن ) = | 4 - ZI - ZAN |

لە پاش ئەوەی ، کە ئەم نەختە بەراوردەت دی لام وایە لەگەڵما بی کە بڵێم زمانی کوردی نەوەی نوێی زمانی ( ئاوێستی )یە ، یاخود ( میدی )یە ، ئەگەر واش نەبێ ، هەر دوو دڵ بووی لە رایەکی‌تر ئەگەر هەت بووبێ ، زۆر ئاسایە ، ئەم ئێشە ئەمە نیە لێرەدا بوترێ و بخرێتە روو ، ئەمە ئێشی چەند زانایەکی زمانە ، وە ئێشی چەند ساڵێکی سەرە مرەیە •

من خۆم هیچ گومانم نیە کە زمانی کوردی نەوەی نوێی زمانی میدیە •



منتدى إقرأ الثقافي

# دەنگ سازی ( فۆنۆلۆژی )

دەنگ سازی ، هەر وەکو لە بەشی یەکەمدا ، ناوو نیشانمان هەڵدا ، زانستێکە خۆی تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە ، لە دەنگەکان و فۆنیمەکانی زمان ، کە بە شێوەیەکی رێکو پێک لە دەم مرۆڤەوە دەر دەچن لە سەر رێو شوێنێکی زانستی بڕوا پێ کراو •

**دەنگ سازی زمانی کوردی :**

دەنگ سازی زمانی کوردی ئەو زانستەیە کە خۆی تەرخان کردوە بۆ لێکۆڵینەوە لە کەرەسەی زمانی کوردی ، وە بە لای منەوە کەرەسەی زمانی کوردی پێک هاتوە لەم شتانە :

**١ ـ گۆ کردن** **Pronunciation**

**٢ ـ دەنگ و جیاوازی نێوان دەنگ و پیت •**

**٣ ـ فۆنیم چی‌یەو چەند جۆرە ؟؟**

**أ ـ کۆنسونانتەکان** ( ئاوازە دارەکان )

**ب ـ هێشوە کۆنسونانتەکان** **(Consonant Clusters)**

**ح ـ بزوێنەکان** **(Vowels)**

**د ـ دەنگ گۆڕکێ و هێز و ماوەو بەرزونزمی**
**(Stress, pitch and Juncture)**

**٤ ـ ئەندامانی ئاخاوتن** **(Organs of Speech)**

**٥ ـ دەست نیشان کردن و ناو و نیشان هەڵدانی کۆنسونانتەکان •**

**گۆ کردن** **(Pronunciation) :**

گۆ کردن ، مانای چۆنیەتی دروست‌کردنو دەرهێنانی یاسای دەنگی ( قسە ) زمان دەدات ، وە بەشێوەیەکی روونتر ، ئەندازەی بەشدار بوونی ئەندامانی ئاخاوتن لە دروست کردنو دەرهێنانی دەنگی رێکو پێکی واتا دار دا •



منتدى إقرأ الثقافي

گۆ کردن لە یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ • یاخود بە دەگمەن ڕێک دەکەوێ کە دووکەس هەموو شتێکی زمان وەک یەك گۆ بکەن • ئەگەر چی لە شوێنێکیش‌دا بژین • بەڵام ئەگەر لە جێگای جیاوازدا بژین یاخود ئەندامێ لە ئەندامانی ئاخاوتنی تەواو نەبێ ئەو کاتە جیاوازی میانەی گۆ کردنیان ، هەر ئێجگار زۆرە ، جگە لەمانە هـۆی تـریش زۆرن •

ئەم جۆرە جیاوازیانە کەمەکیانە کە پێیان دەوترێ زرەی دەنگ (accent =) روو دەدات ، لە ناو ئەوانەدا کـە بەزارێک گفتو گـۆ دەکەن ، بەڵام لە دوو زاردا ، جگە لە زرەی دەنگ ، دەنگ گۆڕان و کەم و زیادی رووژ دەدات ، بۆ نموونە با وشەی **( هوجاڕ )** بگـریـن و سەرنج بدەینە گۆ کردنی لە لایەن دانیشتوانی سولەیمـانیو بادینـان و هەورامان‌وە دەبینین کە :

١ ـ سـۆرانی دەنگی / و /ی کورتەو لێو ، هـاتوونەتـەوە یـەک واتا ( هوجاڕ ) •

٢ ـ لە بادینانی‌دا هەمان دەنگ بوە بە / ف / •
واتا ( هەفجاڕ ) •

٣ ـ وە لە هەورامی‌دا ، دەنگی / ۆ / کە کراوەیە ( هۆجاڕ ) ئـەم گۆڕانەش زۆر باوە لە زارە کوردیەکان دا ئەم گۆ کردنە ، تەنها دەنگەکان ناگرێتەوە ، بەڵـکوو هێز (stress) و مـاوە و وەسـتان (stops) و بەرزو نزمی (Pitch & juncture) دەگرێتەوە ، بۆ نموونە :

**١ ـ کەی هاتی ؟ پرسیار**

**٢ ـ دوێنێ هاتم • وەڵام**

**٣ ـ بە ڕاستی ، ئازاد نابوود بوو !!**

**٤ ـ ئەوەی تێ دەکۆشێ ، سەر دەکەوێ •**



منتدى إقرأ الثقافي

له رستەی یەکەمدا ، کە پرسیارە ، ( هێز = Stress) خراوەتە سەر وشەی (کەی)یەوە ، وە وەستانێکی کەمیش وا لە میانەی ( کەی ) و (هاتی)دا ، وە گۆکردنی ئەم رستەیە دەبێ بە جۆرێك بێ کە هەموو کوردی زانێک بزانێ پرسیارە •

هێز لە رستەی دووەمدا وا بە سەر هەردووکیانەوە وە کورتە ماوەیەکیشیان وا لە میانەدا •

لە رستەی سێیەمدا ، سێ هێزیقورس‌مان بەسەر ( راستی ) و (ئازاد) و (نابوود)ەودیە ، ئەمە لە لایەکەوە ، وە لە لایەکی کەشەوە دەوڵەمەندی ( ئازاد ) ئاشکرایە لای پرسیارکەر و بیسەر ، ماوەی کورتیش هەیە لە میانەی وشەیەک و یەکێکیتردا ، بەم جۆرە وەستانانە دەڵێن ( سەرسامی ) •

هەر وەکو ( هێز ) کاریگەرە ، گوێزانەوە و کەمی و زۆریشی ، هەر هەمان دەستوور گاریگەرە ، بۆ زیاتر رۆش بوونەوە تەماشای ئەم جووت وشەیە بکە :

١ ـ هەمانە : هێز وا بە سەر یەکەم بزوێنەوە ، واتا دەنگی دووەم ، وە واتای ئەوە دەدات کەوابڵێیت ( شتمان ) هەیە •

٢ ـ هەمانە : هێز وا بەسەر دەنگی شەشەمەوە واتا بزوێنی سێیەم ، وە مانای کیسەیەک کە لە پێستی مەڕ دروست کرابێ دەدات •

لەم جۆرە وشانەی سەرەوە ، کە هێز بیان گۆرێ لە ماناو ئاوازەدا ، بە پێی گۆڕانی جێگای لە بزوێنێکەوە بۆ یەکێکیتر ، زۆرمان هەن ، لە جێگایەکی ترەوە روونیان دەکەینەوە •

جا لەبەر ئەوەی کە زمانیکوردی باش فێر بکرێت لە لایەن ئەو



منتدى إقرأ الثقافي

بێگانانەی کە دەیانەوێ فێری کوردی ببن وە بۆ ئەوەی فەرهەنگێکی رواڵەتدار هەبێ شێوەی دەنگی وشەکانی تێدا بێتو قوتابیە کوردەکان بە ئاسانی و راستیو رەوانی فێری دەنگە کوردیەکان بکرێن وە جیاوازی میانەی پیتە کوردیەکـان و دەنگەکانیـان بکەن ، بـەلای منـەوە ، زۆر پێویستە ( رەمـزی ) دەنـگی دا بنرێت بـۆ هـەموو دەنگێـك و هێـز و بەرز و نزمی و وەستانێکی زمانی کوردی ، کوردی ، وە بە شێوەیەکی ئاسان و رێك و پێك هەوڵ بدرێت ، بۆ ئەوەی بزانرێت ، کە چۆن ؟ وە لە کوێ ؟ وە بە هۆی چە ئەندامێکی ئاخاوتنەوە دەنگەکان دروست دەبن ؟

دەنگ زۆر گرنگە ، بەڵام شیکەڵا کردنی زۆرتر گرنگە ، چونکە ( دەنگ ساز ، دەنگ بە جەوهەری زمان دەداتە قەڵەم ) • وێنەی دەنگی دانان ، بۆ دەنگە کوردیەکان زۆر ئاسانە ، ئەگەر بزانی بەکاری بهێنی ، لە کاتی بەکار هێناندا •

ئەو رەمزە دنگیە کە بەباش دەکەوێتە بـەرچـاوم ، کـە وەکـو ئەرکێکی سەرشانی خۆم ، بۆ دەنگە کوردیەکانی دادەنێم ، وە رەمزی دەنگی دەخەمە نێوان دوو هێڵی خوارەوە ، وەك ئەمە /••••/ ، وە پیت دەخەمە نێوان دوو کەوانەوە وەك ئەمە (••••) بۆ ناسینی هەر یەکەیان •

دەنگەکان ، هەر وەکو لەوەو پێش وتمان جەوهەری زمانن واتا ، هەر وەکو دەنگ ساز دەڵێ : « زمان بریتی‌یە لـە یاسـەیەکی دەنـگی رێك و پێك • »

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ، ئەویش ئەوەیـە : کـە رێك و پێك چیە ؟•

وەڵامی ئەمە ئەوەیە ، کە ئەگەر دەنگەکان لە وشەیەك ، یا لـە



منتدى إقرأ الثقافي

رستەیەک یا خود لە زاراوێکدا ڕێک و پێک نەبن بە پێی یاسای دەنگی ، ئەو وەختە ، ئەو شتە ئەو مانایە نادات کە مەبەستە ، یا زۆر جار یەکسەر بێ مانا دەبێ ، بۆ نموونە وشەی ( هەنار ) وەرگرین و بە پێی یاسای دەنگی ڕێک و پێک بینووسین ، دەبینین کە پێك هاتوە لەم دەنگانە :

/ ه ە ن ا ر /

لەگەڵ گۆ کردنی ئەم وشەدا ، بەم یاسایە بە گورجی شێوەی میوەکە دێتە بەرچاومان •

با ئەم دەنگانە چەواشۆ کەین و بزانین چی دەبێ ! بێگومان ، دەبێ بەشێوەیە لەم شێوانە :

١ - / ە ه ن ا ر /
٢ - / ن ه ە ا ر /
٣ - / ا ه ە ن ر /
٤ - / ر ا ه ە ن /

ئەم ڕێک خستنە دەنگیانە ، ئەو مانایە نابەخشن کە ئێمە مەبەستمان بوو ، وە بەم جۆرەش هیچ کامێکیان مانا نابەخشێ •

نووسینی زمانی کوردی بەو شێوەیەی کە ئێستا دەینووسین ( واتا بە ئەلف و بێی عارەبی ) زۆر کەم تەنگو چەڵەمە دەهێنێتە بەر ڕێگا ، چونکە کەم ( پیت ) هەیە ، لە نووسیندا کە جێگای ئەو ڕەمزە دەنگیە پێویستیە نەگرێتەوە ، بەڵام یەکێ لە پێویستیەکانی زمانی کوردی ئەوەیە کە ڕەمزی دەنگی دانرێ بۆ دەنگە کوردییەکان •

لە پێش ئەوەی بڕۆینە ناو باسی دەنگە کوردییەکانەوە وای بە باش دەزانین کە باسی :

**جیاوازی نێوان ( دەنگ ) و ( پیت ) بکەین •**

( پیت ) ، هەر وەکو ئەو زمان ناسانە کە خۆیان خەریك کردوە



منتدى إقرأ الثقافي

یە لێکۆڵینەوەی مێژوی زمانەوەو وتوویانــە ، وێنەیەکە کە زۆر لە مێژەوە دانراوە وە بەرە بەرە و وردە وردە گۆڕانی بە سەردا هاتوە ‹‹ وەختی خۆی (پیت) بە وێنەی ، وێنەیەکی ئەوتۆ دانراوە ، کــە مانای شتێکی دابێ ، کە وەکو ناوێك یا زاراوێك یا رەمزێك بوە ، بەڵام ئێستا ئــەو وێنــە کۆنەیە نەماوە ، وە بەکار هێنانی ئێستای لە نووسین‌دا تەنها بۆ وێنە گرتنی زمانە ، کەوابوو نووسین ، زمان نی‌یە ، بەڵــکو وێنەیەکی زمانــە ، وە هەرگیز ناتوانین بە نووسین بلێین زمان تا زیندو نــەکرێتــەوە • هــەر (پیتێك) ناوێکی هەیە ، وە هەر ناوێك بتر لە دەنگێك پێك هاتوە ، بۆ نموونە ئەگەر ورد بینەوە لە ناوەکەی ئەم پیتە ( ژ ) ژێ‌یە ، دەبینین ، پێك هاتوە لەم دەنگانە :

١ ـ / ژ /
٢ ـ / ێ /

وە ئەگەر ناوێکی عارەبی پێوەنێن ، هەرچی ئەوان پیتی وایان نیە ، دەبێ ( ژیم ) بێ ، کە پێك‌هاتوە لە سێ دەنگ ، / ژ / ، /ی/ ، / م /•

بۆ زیاتر روون کردنەوە ، با ورد بینەوە لەم وشــە ئینگلیزیــە ، کەئەویش وشەی ( cat ) ە ، دەبینین کە پیتی / C / سی ، بەکار هاتوە لە جیاتی دەنگی / K / ، کە هەر یەکە ناوی لەوی‌تر جیاواز ترە ، لە کوردیش‌دا وە بە تایبەتی لە نووسینی لاتینی‌دا[٣٦] ، هەندێ جار زیاتر لە پیتێ ، بەکار دەهێنرێ ، لەباتی دەنگێ ، بۆ نموونە ، ئەگەر دەنگی /غ/ ، ویسترا ، ئەو کاتە ئەم دوو پیتە ( CH ) بەکار دەهێنرێت لە باتی •

با نەختێ‌تر ورد بینەوە لەم وشانەی خوارەوە •

---

(٣٦) بۆ دەنگی /ق/ دەبێ ( Q ) بەکاربهێنین کە ئەمیش زۆر دوورە لە دەنگی /ق/ وە ( واتا ئەو /ق/ یە کە نیمە ( گۆی ) دەکەین •



منتدى إقرأ الثقافي

١ ـ شڕ •

٢ ـ شەڕ •

٣ ـ شۆڕ •

٤ ـ ڕەش •

لەم چوار وشەیەدا ، پیتی ( ش ) بەکار هاتوە لە باتی چوار دەنگی نەختێ جیاواز لە یەکتری ، وە شتەکەش ئاساییە لە دەنگ سازیدا ، دەبێ بۆ هەر یەکێکیان رەمزی دەنگی هەبێ • وە هەر وەکو لەوەوپێش وتمان دەنگ دەخەینە نێوان دوو هێڵی خوارەوە وەکو ئەمە / ــ / ، وە پیت دەخەینە نێوان دوو کەوانەوە • ئەگەر ورد ببینەوە لە دەنگی / ش / لە جێگا جیاوازەکاندا دەبینین کە :

١ ـ دەنگی /ش/ لە وشەی یەکەمدا ( ژێری ) لـە ژێـرەوەیـە واتـا ( کسرە )ی عارەبی •

٢ ـ دەنگی / ش / لە وشەی دووەمدا وەکـو کورتە سـەرێکی بـە سەروە بێ وایە •

٣ ـ دەنگی / ش / لە وشەی سێیەمدا ، وەکو کورتـە بۆرێکی بـە سەروە بێ وایە •

٤ ـ دەنگی / ش / لە وشەی چوارەمدا ، دەنگی تەواوە ، چونکە لە سەری وەستاوین •

ئەم جۆرە دەنگە جیاوازانەی دەنگی / ك / پێی دەوترێ فۆنیم • بە رای من پێویستە هەر یەکە لەم دەنگانە رەمزی دەنگیان بۆ دانرێت ، من بۆ هەر یەکە لەم دەنگانە رەمزێکم بۆ داناوە ، ئەوانەش بەم جۆرەن •

١ ـ بۆ دەنگی /ش/ ، لە وشەی یەکەمدا ژێرێکم داوەتێ ، واتا بـەم جۆرە //شِ/ •



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ هي دووەمیان بەم جۆرەیە /شَ/ واتا کورتە سەرمان داوەتێ •

٣ ـ هي سێیەمیان بەم جۆرەیە /شُ/ ، واتا بۆرمان بە سەرەوە داناوە •

٤ ـ هی چوارەمیان ، وەک خۆی بە سادەیی هێشتمانەوە ، واتا بەم جۆرە /ش/ •

لام وایە ، هەر یەکە لە کۆنسوناتنە کوردیەکان نزیکەی چوار دەنگی هەیە ، وە ئەگەر هەر یەکەیان لە یەک دەنگ زیاتری نەبێ ئەوە بە تاقە دەنگ دەدرێتە قەڵەم (allophone) نەک بە ( فۆنیم ) •

**فۆنیم چییەو چەند جۆرە**[٣٧]

١ ـ فۆنیم (Phoneme) ی دەنگێ ؟ بریتیە لە چەپکە دەنگێ (a bandle of sounds) (چەپکە دەنگێکی جیاوازی ئەو تاقە دەنگە ، واتا ئەم چەپکە دەنگانە ، لە بنەڕەتدا ، لە یەک دەنگەوە دروست بوونو وەرگیراون ، ئەویش هۆی ئەوەیە کە لە شوێنی جیاواز جیاوازدا بەکار هاتوون وە ئەو دەنگانەش کە بەرو دوایان گرتوون ، کاریان تێ کردون)•

بۆ نموونە ورد بەرەوە ، لە دەنگی /س/ ، لەم وشانەدا :

١ ـ سەر

٢ ـ سوور

٣ ـ سرکە

٤ ـ داس

لە وشەی یەکەم دا دەنگی /سَ/ سەری بە سەرەوەیە وە لە وشەی دووەمدا دەنگی /سُ/ بۆری بە سەرەوەیە وە لە وشەی سێیەمدا دەنگی /سِ/ ( ژێر ) دارە ، وە لە وشەی چوارەمدا ( دەنگی /س/ )

(٣٧) بڕوانە بەشی زانستیی زمان ، بزانە چۆن تاریف کراوە ؟



منتدى إقرأ الثقافي

لە سەری وەستاوێن و نەختێ لە درێژ دەکات ، ئەمە ساکار ترین دەنگی /س/ە ، لەبەر ئەوە بە ساکاری هێشتمانەوە ، بەم کۆمەڵە دەنگانەی دەنگی /س/ دەوترێ ؛ فۆنیمی /س/ •

٢ ـ با ورد بینەوە لەم دوو وشەیە :

١ ـ کردن

٢ ـ بردن

وشەی یەکەم پێک هاتوە ، ئەگەر بێتوو هەندێ دەنگی شارراوە سە زمێر نەکەین ، لە چواردەنگە کۆنسوناتی یەک بە شوێن‌یەک ، هەر وەها هەمان دەستوور لە گەڵ وشەی دووەمدا • ئەم دوو هێشوە دەنگە (Consonant Clusters) وەک یەکن ، تەنها جیاوازی‌یەکیان هەیە ، کە ئەویش دەنگ / ك /ە لە یەکەم ، وە دەنگی /ب/ە لە دووەمدا ، بە هەریەکە لەم کۆمەڵە دەنگانە دەوترێ : ( فۆنیم ) •

٣ ـ با تەماشای ئەم دوو رستەیەو گۆ کردنیان بکەین :

١ ـ دوێنێ هات •

٢ ـ دوێنێ ، هات ؟؟

رستەی یەکەم وەڵامە ، بۆ پرسیارێک کە کراوە ، لە بەر ئەوە هێز بە یەکسانی وا بە سەر وشەی ( دوێنێ ) و ( هات )ە وە • بەڵام لە رستەی دووەمدا ، هێزی قورس وا بە سەر وشەی ( دوێنێ )وە ، بۆیە دەنگی / ی / کەمان درێژ کردوەتەوە ، وە هێزێکی کەمیش وا بەسەر ( هات )ە وە • ئەمەش بۆیە وایە ، چونکە ئەمە پرسیارە ، دوو بارە کردنەوەیە بۆ ( تاکید ) ، دوور نی‌یە شتێکی لەم رووەوە نەبیستبێ بەڵام بڕوای نەکردوە ، یا بە تەوای گوێی لێ نەبوە ، لەبەر ئەوە ئەو پرسیارەی کردوە • ئەم دوو رستەیە هەرچی لە نووسین‌دا وەك یەکن ،



منتدى إقرأ الثقافي

بەڵام لە بەرزو نزمی و هێزدا واتا لە گۆ کردن دا وەک یەك نین ، لەبەر ئەوە واتاکەیان گۆڕاوە وە بە هەر یەکەیان دەوترێ کۆمەڵە فۆنیم •

لە بەشی زانستیی زماندا باسی ( فۆنیم )مان کرد ، وە رای هەندێ زانامان ، لەم رووەوە دەرخست ، وە جۆرەکانیش‌مان یەکە یەکە ژماردن ، لام وایە پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات •

زمان ناسەکان ؛ وا بڕیاریان داوە ، کە فۆنیمەکان ، بریتی بن لەمانەی خوارەوە :

ا ـ **دەنگە** ناوازە دارەکان (Consonants) وە هێشووەکانیان (Consonant Clusters) .

**ب ـ بزوێنەکان** (Vowels) (Semi Vowels)

**ح ـ دەنگ گۆڕکێ** (assimilation) و هێز (stress) وە بەرز و نزمی (Pitch & juncture) .

**دەنگە ئاوازە دارەکان : : Consonants**

دەنگە ئاوازە دارەکان ، لە رووی دەنگ داریو کەم دەنگی‌یەوە ، دوو جۆرن • جا تەواو دەنگ داربن یاخود کەم دەنگ‌بن ، لە دروست بوونی زوربەیاندا یاخود هەموویاندا، ئەو هەوایەی کە لە سی‌یەکانەوە دێتە دەرەوە رێگای پێ لێژ دەکرێت ، جا وەختی وا هەیە ، ئەم رێگایە زۆر تەنگی پێ هەڵچنراوە ، وەوەختی واش هەیە کەم ، ئەمیش بە هۆی ئەندامانی ئاخاوتنەوە دەبێ •

دەنگە ، دەنگ دارەکان (Voiced) ، گۆ دەکرێن لە گەڵ لەرینەوەی ( ژێیە ) دەنگی‌یەکان ، بەڵام کەم دەنگەکان ،گۆ دەکرێن بەبێ ئەوەی ( ژێیە ) دەنگیەکان بلەرێنەوە ، یاخود ئەگەر بشبێ زۆر کەمەو هەستی پێ ناکرێ • وا لە خوارەوە دەنگە ئاوازە دارەکان بە ( دەنگ‌دار )و ( کەم دەنگ )، وە لە لیستەدا پێشان دەدەین :



منتدى إقرأ الثقافي

## ١ ـ لیستەی دەنگە دەنگ دارەکان

| دەنگ دارەکان Voiced | نموونەیان لە وشـەدا | |
|---|---|---|
| / ب / | وەکو لەوشەی ( کەباب ) دایە | |
| / د / | « « ( بەرد ) « | |
| /د/ /د:/ | « « ( نمەد ) « | (٣٨) |
| /گ/ | « « ( رەگ ) « | |
| /ڤ/ | « « (مرۆڤ) « | |
| / ژ / | « « ( کەژ ) « | |
| / ج / | « « (مەوج) « | (٣٩) |
| / م / | « « ( مۆم ) « | |
| / ز / | « « ( رەز ) « | |
| / ن / | « « ( نان ) « | |
| / ل / | « « ( مل ) « | |
| / ڵ / | « « ( گوڵ ) « | |
| / ر / | « « ( هەنار ) « | |
| / ڕ / | « « ( کەڕ ) « | |
| / ح / | « « ( وەح ) « | (٤٠) |
| / خ / | « « ( مۆخ ) « | |
| / ق / | « « ( رەق ) « | |
| / ع / | « « ( باع ) « | |
| / غ / | « « ( درێغ ) « | |
| / نگ / | « « (رەنگ) « | (٤١) |

(٣٨) نمەد = لەباد بەزاری سولەیمانی و هەورامان ·

(٣٩) مەوج = جاجم ، بە زاری هەورامی ·

(٤٠) بۆ لێخورینی ( گا )

(٤١) د· مەکەنزی ئەم کۆنسونانتەی بە تاقە دەنگێك داوەتە قەڵەم **(واتا** = allaphone) ، بەڵام رەنگبێ بۆیـە وای وتبێ ئـەم وشـانـەی نەبیستبێ : =



منتدى إقرأ الثقافي

## ٢ ـ لیستەی کەم دەنگەکان

| دەنگە کەم دەنگەکان Voiceless | نموونەیان لە وشـەدا |
|---|---|
| / پ / | وەکو لەوشەی ( رەپ ) دایە |
| / ت / | « « ( رەت ) « (*) |
| / ك / | « « ( لاك ) « |
| / چ / | « « ( وەچ ) « |
| / ف / | « « ( دەف ) « |
| / س / | « « (هەوەس) « |
| / ص / | « « (شەص) « |
| / ش / | « « ( رەش ) « |
| / ھ / | « « (ئەژدەھا) « |
| / ئـ / | « « ( ناء ) « (**) (***) (****) |

= (رەنگ) ، (دەنگ) ( مەنگۆڕی ) ، ( هەنگوین ) ، ( پەنگاو ) ، (لینگاو) زۆری‌تر ٠

( Kurdish Dialect studies, Mackenzie, 1 ).

(*) دەنگی/ط/دەبیستریّ لـە کرمـانجی ژووروودا وە لام وایـە لـە سەرەتای وشەوە دیّت وەك ( طەڕ )و ( طاوە ) ٠٠ ( لـە کـاك فارق ئامیدی‌یەوە وەرم گرتوون ) ٠
وشەی (رەت) مانای ( تەڵە ) دەدات ٠

(**) وەختیّ بتەویّ وەڵامی پرسیاریّ بدەیتەوە ئەم (ناء)ە بەکار دەهیّنن وەك :
(پ) : ئەریّ کتیّبەکەت خوێندەوە ؟
(و) : ( ناء ) یا خود ( نا ) بەڵام هەر چۆنیّ بیلّیّیت هەر ئەم جۆرە دەنگە / ء / دروست دەبیّو دەبیستریّ ٠

(***) دەنگی / ظ / ش ، هەر دەبیستریّ لە زارەکانی ژووروودا وەك ئەوەی لەم وشانە دایە :
ظەلام ( زەلام ) دەنگی / ز / کە ، زۆر قەڵەوە لەوە دەکات کە /ظ/ بیّ ٠ وە ( زۆم = هەوار ) وە ( زۆزان ) واتـا ( زستان ) دەنگی / ز / کە قەڵەوە ٠



منتدى إقرأ الثقافي

. . . . . . . . . . . .

---

(****) وا رێك دەكەوێ كە ئاڵ و گۆڕێكیدەنگی لــە زارێكــەوە بــۆ زارێكی تر روو بدات ، وەلام وایە ، هــەندێ هۆشمان لــەم رووەوە دەرخست ، وە زوربەی ئەم ئاڵ و گۆڕەش بەم جۆرەی خوارەوەیە :

١ ــ گۆڕینی / و / ، بــە دەنگی یــا / م / ، یــاخــود /ڤ/ ؛ وەك :

ناو ( سۆرانی ) ➤ نامێ ( هەورامی ) ➤ ناڤ (كرمانجی)

٢ ــ هەندێ جار دەنگی /ب/ ، دەبێ بە دەنگی /و/ ؛ وەك :

بابە ( سۆرانی ) ➤ باوە ( شارەزووری )

لابە ،، لاوە ،،

یاخود دەبێ بە /گ/ ، وەك :

هاتوە ( سۆرانی ) هاتگە ( شارەزووری )

٣ ــ هەندێ جار دەنگی / ت / ، یاخود دەنگی / گ / دەبێ بە دەنگی /:د/ی كلۆر ، وەك :

براكەت /براكە :د/ ) لەگۆ كردندا

براكە :د )

ئاگر ئا :در ) گەرمیانی و شارەزووری

/ ئــ ا : در /

سەگ سە :د ) ،، ،،

/ س ە : د /

٤ ــ هەندێ جار دەنگی /د/ ، دەبێ بە دەنگی /:د/ی كلۆر ، وەك:

بەغدا / بەغ : دا /

/ بەغ : دا / لە گۆ كردندا

/ ب ە غ ا /

٥ ــ هەندێ جار دەنگی/ل/ دەبێ بە دەنگی /ر/ ؛ وەك :

گەلاڵە ➤ گەرارە ( خۆشناوەتی )

بەڵێ ➤ بەرێ ،،



منتدى إقرأ الثقافي

. . . . . . . . . . . .

٦ ـ هەندێ جار دەنگی /ۆ/ ، کە زۆر درێژە دەبێ بە دەنگی /ۆ/، کە زۆر کراوە و کورتە ، وەك :

سوور (سۆرانی)   صۆر ( هەولێری )

٧ـ هەندێ جار دەنگی/ی/یاخود دەنگی/ت/دەبێ بە دەنگی/س/وەك:

وایە ( سۆرانی ) ≻ واسە ( شارەزووری )

هاتوەتۆ ،،   ≻ هاتگەسۆ   ،،

٨ ـ دەنگی / گ / ، دەبێ بە دەنگی /وی/ ، وەك :

ئاگر ( سۆرانی ) ≻ ئاویر ( هەورامانی )

ئایر

٩ ـ هەندێ جار دەنگەکانی /کی/ دەبن بە دەنگەکانی /چی/ ، وەك :

کیلۆ ( سۆرانی ) ≻ چیلۆ ( هەولێری )

کێرد   ،،   چێرد   ،،

کێل   ،،   چێل   ،،

١٠ـ هەندێ جار دەنگی /ڕ/ ، دەبێ بە دەنگی /ر/

کوڕە ! ( سۆرانی )   کورە ! ( هەورامانی )

[redacted]

١١ـ دەنگی / ێ / ی ( کۆ ) کردن لە زاری هەورامانیدا ، دەبێ بە / ـ ان / لە زاری سۆرانیدا ، وەك :

کناچێ ( کچان )

زارولێ ( منالآن )

پیێ ( پیاوان )

١٢ـ هەندێ جار دەنگی /ر/ ، دەبێ بە دەنگی /ل/ ، وەك :

شیرە ( هەورامانی ) ≻ شیلە ( سۆرانی )

١٣ـ هەندێ جار دەنگی / ە / دەبێ بە دەنگی /ێ/ ، وەك :

پەنج ( هەورامانی ) ≻ پێنج ( سۆرانی )

١٤ـ هەندێ جار دەنگی /ی/ ، دەبێ بە دەنگی /ش/ ، وەك :

کردی ( سۆرانی ) ≻ کەردش ( هەورامانی )

بردی   ،،   بەردش   ،،



منتدى إقرأ الثقافي

• • • • • • • • • • • •

١٥ ـ هەندێ جار دەنگێ یاخود زیاتر لە دەنگێك دەقرتێ لە گۆ کردندا ، وەك :

أ ـ نووست نووس
ماست ماس
دەست دەس

ب ـ خەوت ( سۆرانی ) ≶ وت ( هەورامانی )
بەرد ( سۆرانی ) ≶ بەر ( کرمانجی )
ئارد ،، ئار ،،
گەرد ،، گەر ،،
کرد ،، کر ،،
ئێوە ،، وە ،،
ئەوان ،، وان ،،

حـ ـ وەختی وا هەیە وشەکە سەرپاکی گۆڕراوە ، وەك :

بڵێ ( بێژە ) یاخود ( واچە )
بەرد تەوەنی

د ـ دەنگی / ڤ / بوە بە دەنگی /س/ وە
دەنگی / ز / بوە بە دەنگی /ت/ ، وەك :

زۆزان (کرمانجی) ≶ زستان ( سۆرانی )
زمستان ) ( هەورامانی )
زمســـان )

١٦ـ هەندێ جار دەنگی /ێ/ لە زاری سۆرانیدا دەبێ بە دەنگی / ا / لە زاری هەورامیدا ، وەك :

پێ ≶ پا

١٧ـ هەندێ جار دەنگی / ـ ۆ ـ / لە زاری سۆرانیدا دەبێ بـە بە دەنگی / ـ ی ـ / لە زاری کرمانجیدا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| دوور | دیر | / دۆیر / |
| روون (رۆن) | رین | / رۆین / |
| شوو | شـی | / شۆی / |
| موو | می | / مۆی / |



منتدى إقرأ الثقافي

• • • • • • • • • • • •

---

١٨ـ هەندێ جار دەنگی / ـ و / لـە زاری سـۆرانی‌دا دەبێ بـە دەنگی / ـ ف ـ / لە زاری کرمـانجی و لـوڕی‌دا ، وەك :

حەوت ( سۆرانی ) ، حەفت ( کرمانجی ـ لوڕی )

خەوت ( سۆرانی ) ، خەفت ( کرمانجی ـ لوڕی )

١٩ـ هەندێ جار دەنگی / ـ ب ـ / لـە زاری سـۆرانی‌دا دەبێ بە دەنگی / ـ و ـ / ، لە زاری لوڕی ، و خانەقین‌دا ،وەك :

بەفر (سۆرانی) وەفر (خانەقین)

وەروە ) (هەورامانی)

وەرڤە )

٢٠ـ هەندێ جار دەنگی / پ / لـە زاری سـۆرانی‌دا ، دەبێ بـە دەنگی / و / لە زاری شارەزووری‌دا ، وەك :

تەپ (س) ← تەو (ش)

لەپ (س) ← لەو (ش)

چەپ (س) ← چەو (ش)

قەپ (س) ← قەو (ش)

٢١ـ وەختی وا هەیە دەنگی / م / لە زاری سۆرانی‌دا دەبێ بـە دەنگی / و / لە زاری شارەزووری‌دا ، وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| شەرمەزار | ( سۆرانی ) | شەروەزار | ( شارەزووری ) |
| شەمە | ،، | شەووە | ،، |
| دەرمان | ،، | دەروان | ،، |
| چەم | ،، | چەو | ،، |

٢٢ـ هەندێ جار دەنگی /ش/ لە زاری سۆرانی‌دا دەبێ بە / ژ / لە زاری خانقین و لوڕی‌دا

مەڵاشوو ( سۆرانی ) مەڵاژك

مەڵاژی

٢٣ـ وەختی وا هەیە دەنگی /ش/ لـە زاری هەورامانی‌دا ، دەبێ بە دەنگی /س/ لە زاری سۆرانی‌دا ، وەك :

مشت ( هەورامانی ) مست ( سۆرانی )



منتدى إقرأ الثقافي

## ٣ ـ لیستەی ڕەمزی دەنگە کوردی‌یەکان ٠

| پیتەکان و ناوەکانیان | فۆنیمەکان ڕەمزی دەنگی | نموونە لە وشەدا |
|---|---|---|
| (ب) = بێ | / بَ / | وەك لە وشەی ( بـار ) دایـە |
| | / بِ / | « « ( برنج ) « |
| | / بُ / | « « ( بووك ) « |
| | / ب / | « « ( کەباب ) « |
| (پ) = پێ | / پَ / | « « ( پەری ) « |
| | / پِ / | « « (پزیشك) « |
| | / پُ / | « « ( پووش ) « |
| | / پ / | « « ( حەپ ) « |
| (ت) = تێ | / تَ / | « « ( تەڕم ) « |
| | / تِ / | « « (تریشك) « |
| | / تُ / | « « ( تونگ ) « |
| | / ت / | « « ( پەت ) « |
| (س) = سێ | / سَ / | « « ( سەر ) « |
| | / سِ / | « « ( سڕ ) « |
| | / سُ / | « « ( سورمە ) « |
| | / س / | « « ( دەس ) « |
| (ش) = شێ | / شَ / | « « ( شەرم ) « |
| | / شِ / | « « ( شڕ ) « |
| | / شُ / | « « ( شووم ) « |



منتدى إقرأ الثقافي

| پیتەکان و ناوەکانیان | فۆنیمەکان رەمزی دەنگی | نموونە لە وشەدا |
|---|---|---|
| | / ش / | وەك ئەوەی لە ( بەش ) دایە |
| (ف) = فێ | / فَ / | “ “ ( لافاو ) “ |
| | / فِ / | “ “ ( فڕە ) “ |
| | / فُ / | “ “ ( فوو ) “ |
| | / فْ / | “ “ ( دەف ) “ |
| (ڤ) = ڤێ | / ڤَ / | “ “ ( هاڤاڵ ) “ |
| | / ڤِ / | “ “ ( ڤزە ) “ |
| | / ڤُ / | “ “ ( لڤۆنە ) “ (٤٢) |
| | / ڤ / | “ “ ( ناڤ ) “ |
| (ق) = قێ | / قَ / | “ “ ( قاز ) “ |
| | / قِ / | “ “ ( قیر ) “ |
| | / قُ / | “ “ ( قوڕ ) “ |
| | / ق / | “ “ ( رەق ) “ |
| (ج) = جێ | / جَ / | “ “ ( جام ) “ |
| | / جِ / | “ “ ( جل ) “ |
| | / جُ / | “ “ ( جووڵە ) “ |
| | / ج / | “ “ ( مەوج ) “ |
| (چ) = چێ | / چَ / | “ “ ( چەم ) “ |
| | / چِ / | “ “ ( چڕ ) “ |

(٤٢) بە زاری هەورامی ، واتای ( رۆیشت ) دەدات .



منتدى إقرأ الثقافي

| پیتەکان و ناوەکانیان | فۆنیمەکان ڕەمزەی دەنگی | نموونە لە وشەدا |
|---|---|---|
| | / چُ / | وەك لە وشەی ( چۆك ) دایە |
| | / چ / | " " ( ماچ ) " |
| (خ) = خێ | / خَ / | " " ( خاڵ ) " |
| | / خِ / | " " ( خڕ ) " |
| | / خُ / | " " ( خورما ) " |
| | / خ / | " " ( داخ ) " |
| (ح) = حێ | / حَ / | " " (ڕەحەتی) " |
| | / حِ / | وەك لە وشەی (حلحلی) دایە |
| | / حُ / | " " ( حۆل ) " |
| | / ح / | " " ( وەح ) " |
| (ك) = کێ | / كَ / | " " ( کاکە ) " |
| | / كِ / | " " ( کڕ ) " |
| | / كُ / | " " ( کوڕ ) " |
| | / ك / | " " ( دایك ) " |
| (گ) = گێ | / گَ / | " " ( گا ) " |
| | / گِ / | " " ( گیر ) " |
| | / گُ / | " " (گورك) " |
| | / گ / | " " ( ڕەگ ) " |
| (ل) = لێ | / لَ / | " " (لاڵەزار) " |



منتدى إقرأ الثقافي

| پیته‌کان و ناوه‌کانیان | فۆنیمه‌کان ره‌مزی ده‌نگی | نموونه له وشه‌دا |
|---|---|---|
| | / لِ / | وه‌ك له وشه‌ی ( لـم ) دایـه |
| | / لۆ / | « « ( لوڕ ) « |
| | / ل / | « « ( مل ) « |
| (ڵ) = ڵێ | / ڵَ / | « « ( گه‌ڵا ) « |
| | / ڵِ / | « « ( گڵێنه ) « |
| | / ڵُ / | « « ( گڵۆڵه ) « |
| | / ڵ / | « « ( گڵ ) « |
| (م) = مێ | / مَ / | « « ( مەڕ ) « |
| | / مِ / | « « (مریشك) « |
| | / مُ / | « « ( مۆر ) « |
| | / م / | « « ( گۆم ) « |
| ن = نێ | / نَ / | وه‌ك له وشه‌ی ( ناڵـه ) دایـه |
| | / نِ / | « « ( نرگه ) « |
| | / نُ / | « « ( نـۆ ) « |
| | / ن / | « « ( ران ) « |
| (نگ) ... | / نگَ / | « « (ده‌نگاوه‌ر) « |
| | / نگِ / | « « (هه‌نگوین) « |
| | / نگُ / | « « (مه‌نگۆری) « |
| | / نگم / | « « ( ده‌نگ ) « |



منتدى إقرأ الثقافي

| ناوەکانیان و پیتەکان | دەنگی فۆنیمەکان ڕەمزی | نموونە لە وشەدا |
|---|---|---|
| ( ر ) = رێ | /رَ/ | وەك لە وشەی ( دراو ) دایـە |
| | /رِ/ | " " ( برێشکە ) " |
| | /رُ/ | " " ( برۆ ) " |
| | /ر/ | " " ( هەنار ) " |
| (:ر) = ڕێ | /ڕَ/ | " " (ڕەوشەن) " |
| | /ڕِ/ | " " ( کڕێش ) " |
| | /ڕُ/ | " " ( ڕۆناک ) " |
| | /ڕ/ | " " ( دڕ ) " |
| ( ئـ ) = ئێ | /ئـَ/ | " " ( ئەگرە ) " |
| | /ئـِ/ | " " ( ئێرە ) " |
| | /ئـُ/ | " " ( ئۆردوو ) " |
| | /ئـ/ | " " ( ئاء ) " |
| ( د ) = دێ | /دَ/ | " " ( دایە ) " |
| | /دِ/ | " " ( درک ) " |
| | /دُ/ | " " ( دوور ) " |
| | /د/ | وەك لە وشەی ( بـەرد ) دایـە |
| ( د ) = دێ | /:دَ/ | " " ( گەدا ) "(٤٣) |

(٤٣) ئەم جۆرە دەنکە تەنها لە زاری سولەیمانی و شارەزوورو هەورامان و جوانرۆ و گەرمیاندا هەیە ، وە لە زاری هەولێر و کـرمـانجی ژووروودا ، نی‌یە ٠



منتدى إقرأ الثقافي

| پیته‌كان و پیته‌كان و | ده‌نگی فۆنیمه‌كان ره‌مزی | نموونه له وشه‌دا |
|---|---|---|
| | / دِ: / | وه‌ك له وشه‌ی ( به‌دی ) دایه |
| | / دُ: / | « « ( لادۆ ) « |
| | / د: / | « « ( به‌د ) « |
| ( ع ) = عێ | / عَ / | « « (عه‌ودالْ) « |
| | / عِ / | « « ( له‌عل ) « |
| | / عُ / | « « (عوروسی) « |
| | / ع / | « « (باعه‌باع) « |
| ( غ ) = غێ | / غَ / | « « (مۆرغان) « |
| | / غِ / | « « (یه‌غنی كێش) « |
| | / غُ / | « « ( غونچه ) « |
| | / غ / | « « (درێغ)، (تیغ) « |
| ( ژ ) = ژێ | / ژَ / | « « ( ژه‌نگ ) « |
| | / ژِ / | « « ( ژن ) « |
| | / ژُ / | « « ( ژوور ) « |
| | / ژ / | « « ( درژ ) « |
| ( ز ) = زێ | / زَ / | « « ( زه‌نگ ) « |
| | / زِ / | « « ( زرنگ ) « |
| | / زُ / | « « ( زوو ) « |
| | / ز / | « « ( ره‌ز ) « |



منتدى إقرأ الثقافي

| پیتەکان و ناوەکانیان | دەنگی فۆنیمەکان رەمزی | نموونە لە وشەدا |
|---|---|---|
| (ص) = صێ | / صَ / | وەك لە وشەی ( صەد ) دایە |
| | /صِ/ | وەك ئەوەی لە ( شەصت ) دایە |
| | /صُ/ | « « ( صۆر ) (بادینانی ) |
| | / ص / | « « ( شەص ) « |
| ( ھ ) = هێ | / هَ / | « « ( هاژە ) « |
| | / هِ / | « « ( هێرش ) « |
| | / هُ / | « « ( هوون ) ( خوێن ) |
| | / ه / | « « ( شاه ) « |

| پیتەکان و ناوەکانیان | بزوێنەکان رەمزە دەنگیەکانیان | نموونەی دەنگ لە وشەدا |
|---|---|---|
| ( ا ) = ئا | / ا : / | ئەمە دەنگە قەڵەوە و درێژە وەك (کاڵ،قاڵ)(٤٤) |
| | / اَ / | ئەمە دەنگە درێژە ، وەك ( ئاو ) ، ( داو ) |
| | / ا / | ئەمە دەنگە ئاساییە ، وەك ( لادێ ) |
| (ی) = یێ | / ی / | ئەمە کورتە و کەمگیرە وەك (کردی) (بردی) |
| | / یِ / | کەمێك کراوەیە وەك (دیاری) |
| | / یَ / | درێژەو گیرە وەك ( پیر ) ، ( شیر ) |
| | / ێ / | کراوەیە و نەختێ درێژە وەك ( دێ ) |
| | / ی: / | لەوەی پێشوو کەمتر کراوەیە وەك : |

(٤٤) بە (تەنسیری) دەنگی /ل/ قەڵەو دەنگی / ا / کەش قەڵەو بووە ٠



منتدى إقرأ الثقافي

| پیتەکان و ناوەکانیان | بزوێنەکان رەمزە دەنگیەکانیان | نموونەی دەنگ لە وشەدا |
| --- | --- | --- |
| | | ( کناچی ) بە زاری هەورامی کە دەنگی /ی:/ پاشبەندی ( کۆ )یە لە هەورامی‌دا ، واتای ( کچان ) دەدات |
| (و) = وێ | / ی: / | نیمچە بزوێنە لە سەرەتاوە دێت وەک ( یاری )، |
| | / و / | ئەمە زۆر کورتە وەک لە ( کورد ) دایە |
| | / ۆ / | ئەمە زۆر درێژە وەک لە ( شوو ) دایە |
| | / ۆ / | ئەمە کراوەیە وەک لە ( دۆ ) دایە |
| | / و: / | لە گۆ کردنی ئەم دەنگەدا لێوەکان دێنەوە پەك لە ( گەرمیان ، بادنیان ، شارەزوور جوانرۆ ) بەکار دەهێنرێت وەك لە ( گویز ) دایە |
| | / ۆ / | ئەمە کراوەیە وەك لە ( دێوانە ) دایە |
| | /و:/(٤٥) | ئەم دنکە نیمچە بزوێنە لە سەرەتای وشەوە دێت وەك لە ( وڵات ) دایە |
| (ه) هێی‌خڕ | /ه/(٤٦) | ئەمە تەنها تاقە دەنگێکە وەك لە (وەرە) دایە وە بەفۆنیم نادرێتە قەڵەم : ( بەرای‌من • ) • |

(٤٥) زۆر جار ئەم جۆرە دەنگە ، / و : / ( ئەم نیمچە بزێنە ) لە زاری هەورامی‌دا دەبێ بە دەنگی /ف/ ، وەك :
ڤەرو = وەروە = بەفر (س)
یاخود هەندێ وشە کە بە نیمچە بزوێن دەستی پێ‌کردوە دەنگی /ک/ ، دەخرێتە پێشیەوە ، وەك : ( وتی ) ، دەبێ بە (گوتی) •

(٤٦) وەختی واش هەیە ، کە دەنگی /ب/ لە زاری سولەیمانی دەبێ بە دەنگی / و / لە زاری شارەزووردا وەك :
کەباب ( سولەیمانی )
کەواو ( زاری شارەزوور )
لابە (س)
لاوە (ش) •



منتدى إقرأ الثقافي

## هێشوە کۆنسونانتەکان (Consonant Clusters)

کۆبوونەوەی چەند دەنگێکی ئاوازەداری یەک بە شوێن یەکدا ، بەبێ ئەوەی بزوێنێك جیایان بکاتەوە ( ئەگەر بزوێنی شـارراوە سـەر ژمێر نەکەین) یەکێکە لەو دیمانە ( صفات ) ، کمە زمانی کوردی جیـا کردوەتەوە ، لە زمانە سامی‌یەکان ، وە دیمێکی دیاری‌یە کە زوربەی زمانە هیندو ـ ئەوروپاییەکان بەشدارینی •

گۆ کردنی هێشوە دەنگی ئاوازەدار • زۆر ئاسانە ، لە لایەن ، ئەو گەلانەوە کە بە زمانی هیندو ـ ئەورووپی قسەدەکەن ، جا هەر لـەبـەر ئالوودە نەبوونی و ڕانەهاتنە ، کە عارەبەکان ، ناتوانن ئەو جۆرە وشانە بەراستی‌و ڕوانی گۆ بکەن ، کە پڕن لە هێشوە کۆنسونانت ، یا ئەگەر تێش کۆشن بۆ گۆ کردنیان ، دەیان شکێنن بە یەکدا ، وە تامی زمانی ئەو زمانەی تیایا ناهێڵن ، چونکە وەکو سەرو بۆرو ژێری بۆ بکەن وایە •

لە زمـانی کوردی‌دا ، نمونـەی‌هێشـوە کۆنسونانت زۆر زۆرە ، ئەمەش چەند نموویەکن :

| | نموونەی وشە | نووسینی دەنگی | ژمارەی دەنگ لە هێشووەکەدا |
|---|---|---|---|
| ١ | مل | /مِ ل/ | (دوو) دەنگ کۆ بوەتەوە |
| ٢ | ملت | /مِ لِ ت/ | (سێ) دەنگ کۆ بوەتەوە |
| ٣ | مردن | /مَ ر دِ ن/ | (چوار) دەنگ کۆ بوەتەوە |
| ٤ | ڕێکخستن | /ـكخِ ستِ ن/ | (پێنج) دەنگ کۆ بوەتەوە |

### بـزوێنـەکـان ( Vowels ) :

ژمـارەی دەنگـە بزوێنەکـان ، لـە زمـانی کوردی‌دا زۆرە ، بـە پێچەوانەی زمانی عارەبی کە تەنها سێ بزوێنی هەیە ، هەم‌دیسان ئەم



منتدى إقرأ الثقافي

بزوێن زۆرییە ، دیمێکی کەی زمانی کوردی و زمانە هیندو ـ ئەوروپاییەکانە •

زمانی کوردی نزیکەی دوانزە ـ تا سیانزە بزوێنی ئاشکرای هەیە ، وە نزیکەی سێ کورتە بزوێنی هەیە کە شارراوەن ( زۆر کەم ئاشکران ، جگە لە یەکێکیان کە وەکو ژێری عارەبی وایە وە لە نووسینی لاتینیدا تەنهائەمە چارەسەر کراوە ، بەڵام گیرو گرفتی تر هاتوەتە بەر رێگا ) •(٤٧)

---

(٤٧) نووسینی زمانی کوردی بە پیتی لاتینی ، هەر وەك هەندێ گیر و گرفتی چارەسەر کردوە ، هەندێ تەنگ و چەڵەمەشی هێناوەتە بەر رێگا •

هەرچی لێرەدا ، ماوەمان نییە ، بە درێژی باسی ئەمە بکەین ، بەڵام هەر نەختێ لێی ئەدوین •

أ ـ هەندێ پیتی لاتینی هەن لە توانایانا نییە ئەو دەنگانە بدەن کە لە گۆ کردندا دەر دەکەون ، ئەمەش لقە باسێکی ( دەنگ سازی = زانستی دەنگ )ە ، لە جێگایەیەکی ترەوە باسی دەکرێ •

ب ـ بەڵێ نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی هەموو جۆرە شتێك ئاسان دەکات ، بۆ کوردە خوێندەوارەکان ، بەڵام گرانی دەکات و هەندێ دەنگیشی دەگۆڕێ ( هەندێ دەنگی کوردی بە جۆرە دەنگێکی لاتینی گۆ دەکرێن ) ، وە بە تایبەتی لە لایەن رۆژ ئاواییەکانەوە ( چونکە بێ گومان ، هەن کە بیانەوێ فێری زمانیکوردی بەڕاست و رەوانی ببن ) •

بۆ نموونە : ئەگەر وشەی ( قادر ) بە پیتی لاتینی بنووسین دەبێ بەم جۆرە بێ : ( Kadir) یاخود ( Qadir ) • بەڵێ وەختێ کە خوێندەوارێکی کورد ئەو وشەیە بخوێنێتەوە دەڵێ (قادر) ، بەڵام هەر رۆژ ئاواییەکە کە تۆ بیگری هەر دەڵێ ( کادر ) ، چونکە رۆژ ئاواییەکە ئالوودەی ئەم جۆرە دەنگە نەبووە ئەمە لە لایەکەوە ، وە ئەم پیتەش کە بەکار دەهێنرێ بۆ دەرخستنی ئەم جۆرە دەنگە /ق/ە نەی دیوە لە زمانەکەی خۆیدا ، لە بەر ئەوە هەر بە باوی زمانەکەی خۆی بەکاری دەهێنێ •

أ ـ لام وایە ، بۆمان دەر کەوت ، کە نە پیتی ( K ) وە نە هینی =



منتدى إقرأ الثقافي

دەنگە بزوێنە ئاشکراکانی زمانی کوردی ، بە لای منەوە لەوانــە زیاتر نین کە ژماردنم ، ئەوە کە ماوە باسی بکەین لێرەدا (هێشوە بزوێنە)ە

**هێشوە بزوێن :**

یەکێک لە دیمە گرنگە دیاری‌یەکانی تری زمانی کوردی ئەوەیە ، کە بتر لە بزوێنێك کۆ دەبنەوە لە جێگایەکدا (وشـەیەکدا ) ، یەك بە شوێن یەکەوە ، بە پێچەوانەی زمــانــە ســامی‌یەکــان ، وە ئــەمــانــەش نموونەن :

---

= ( Q ) ناتوانن دەنگی /ق/ بدەن بە غەیری کورد وە فێریشی نابن ٠

هەر وەها هەمان تەنگ و چەڵەمە روو دەدات لەگەڵ پیتەکانی ( H ) ، ( gh ) ، | c ...... | دا کە بەکار دەهێنرێن بۆ دانی دەنگی /ح/ و /غ/ و /ع/ ٠

ب ــ نەبوونی جــۆرە پیتێك لــە لاتینیدا ، کــە بتوانن دەنگی /ص/ ، /ط/ ، /ظ/ مان بدەنێ ؛ چونکە ئەم جۆرە دەنگانە بە تاك و تەراك لە زارە کوردیەکاندا دەبیسترێن ٠

حـ ــ نەبوونی جۆرە پیتێ لــە لاتینیدا کــە بتوانێ دەنگی / ء / ( واتا هەمزە )مان بداتێ ، کە ئێجگار زۆرە لە زمانی کوردیدا ٠

د ــ بەکار هێنانی پیتی ( a ) بۆ دانی دەنگی / ا /ی درێژ لە ناوەڕاست و کۆتایی وشەدا ، وە دوو دەنگ ( دەنگی / ا /ی درێژی وە دەنگی / ئ / ) لە سەرەتای وشەدا ، کە ئەمەش زۆر نەگونجاوە و هەڵەیەکی باوی زمانی ( لاتینی )شە ٠ وەك :

١ ــ ( ab ) ؛ کە گۆکەی ( ئاب )ە : لێرەدا ( a ) ی بەکار هاتوە لە جیاتی دەنگی / ئـ / ، / ا /ی درێژ ٠

٢ ــ (amade) ؛ کە گۆکەی ( ئامادە )یە ، واتا پیتی ( a ) دانراوە لە ناوەڕاستدا بۆ ئەوەی دەنگی / ا /ی درێــژ بدات ، کە لە گەڵ هینەکەی پێشوودا زۆر جیاوازە ٠



منتدى إقرأ الثقافي

| | Vowel Clusters | |
|---|---|---|
| ١ | / ــ ه ۆ / | دەنگی دوو لۆ (diphthong) وەك لە ( شەو )دایە[٤٨] |
| ٢ | /ــ اَوە ــ/ | ” سێ لۆ (triphthong) ” ” (ساوەر) ” |
| ٣ | /ــ اَ ۆای/ | ” چوار لۆ ” ” (ئاوای) ” |
| ٤ | /ــاَۆایی/ | ” پێنج لۆ ” ” (ئاوایی) ” |

**دەنگی نەماو ( سواو ) ، یاخود گۆڕاو :** [٤٩]

هەندێ جار ، ڕێك دەكەوێ ، كە لە وشەیەكدا یاخود لە فرەیزێدا ، دەنگێك ون ببێ یا بگۆڕێت بە دەنگێكیتر ، بە هۆی ئەو دەنگەوە لە پێشیەوە یا لە پاشیەوە دێت ، یاخود بە هۆی بەسەر چوونی.

---

(٤٨) ( تەماشای : خوێن ، گوێ ، شوێن ) .

(٤٩) دەنگە گۆڕكێ ، جوانترو ڕۆشنتر دەر ئەكەوێ ئەگەر بەراوردی دەنگی ، یاخود دەنگەكانی زارە كوردیەكان بكەین :
بۆ نموونە ، تەماشای ئەم دەنگانە ( /و/ ، /ت/ ، /ب/ ، /ڕ/ ) لە زاری سولەیمانی دا بزانە چی بە سەر دێت لە زاری ناوچەی شارەزووردا ؟؟

أ ــ دەنگی /و/ی سولەیمانی دەبێ بە /گ/ی شارەزوور وەك :

| | | |
|---|---|---|
| هاتوەتەوە (س) | ( دەبێ بە ) | هاتگەسۆ(ش) |
| ڕۆیشتوەتەوە (س) | ” | ڕۆیشتگەسۆ(ش) \| ڕۆیوەسۆ |
| خواردوویەتی (س) | ” | خواردگیەسی |
| بردوویەتی (س) | ” | بردگیەسی |
| مردووی مردوە (س) | ” | مردگی‌مردگە |
| كردوویەتی (س) | ” | كردگیەسی |

ب ــ دەنگی / ت / دەبێتە دەنگی /س/ ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| وتوویەتی (س) | ” | وتوویەسی (ش) |
| فەرموویەتی (س) | ” | فەرموویەسی (ش) |

حـ ــ دەنگی / ب / دەبێتە دەنگی /و/ ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| خرابە (س) | ” | خراوە (ش) |
| لابە (س) | ” | لاوە (ش) |
| دابە (س) | ” | داوە (ش) |
| داخی بەجەرگم (س) | ” | داخی‌وەجەرگم (ش) = |



منتدى إقرأ الثقافي

دێر زەمانێك بەسەر یەکگرتنی دوو وشەدا ، جگە لەوەش ، هەندێ وشە یاخود زاراو هەن ، کە بە هەموو دەنگەکانی‌یەوە دەنووسرێن ، بەڵام لە گۆ کردندا ، دەنگێك یا خود چەند دەنگێ گۆ ناکرێن یا خود ، وێنەی دەنگێ نووسراوە ، بەڵام گۆکەی بە جۆرێکی کە دەبێت ( واتا بەدەنگێکی کە گۆ دەکرێت ) ، بۆ زیاتر رۆشن کردنەوە تەماشای ئەم نموونانەی خوارەوە بکە :

| | | |
|---|---|---|
| = | | ا وەو قورئانە |
| بەو قورئانە | ،، | \| وەو قورحانە |
| بای داوە بە لایا | ،، | بای داوە وە لایا |
| خەریك نەبێ ! | ،، | خەریك نەوێ |
| ئازا بـە ! | ،، | ئازا وە ! |
| بەشی برابێ !! | ،، | بەشی برا وێ !! |
| کوونی نەبی | ،، | کوونی نەوی ! |

د ـ دەنگی / ڕ / دەبێتە دەنگی /ر/ ، وە :

| | | |
|---|---|---|
| کوڕە ، وا مەکە ! | ،، | کورە ، وا مەکە ! |

هـ ـ دەنگی /ی/ی ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاك لە زاری سولەیمانی‌دا دەبێتە دەنگی /ش/ ، وە بە هەمان ئەرکی ڕێزمانی لە زاری هەورامی‌دا ، وەك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| کردی | (س) | دەبێتە | کەردش (هـ) |
| بردی | (س) | ،، | بەردش (هـ) |
| خواردی | (س) | ،، | واردش (هـ) |

دەنگی /د/ی هەندێ وشە لە زاری سولەیمانی‌دا ، دەقرتێن لە زاری کرمانجی ژووروودا ، وەك :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| بەرد | (س) | دەبێتە | بەر | (ك) |
| مێرد | (س) | ،، | مێر | (ك) |
| ئارد | (س) | ،، | ئار | (ك) |
| کرد | (س) | ،، | کر | (ك) |
| خوارد | (س) | ،، | خار | (ك) |
| گەرد | (س) | ،، | گەر | (ك) |



منتدى إقرأ الثقافي

| | وشە ، یا زاراو بە پێی نووسین | وشە ، یا زاراو بە پێی گۆ کردن | |
|---|---|---|---|
| ١ ــ | داردەست | داردەس | بەپێی زاری سۆرانی |
| | مناڵ | مناڵ | |
| | پەسەند | پەسەن | |
| | بەغداد | بەغـا | |
| ٢ ــ | کاریز ــ هەڵکەند | کاریزکەن | |
| | مر ــ وشك | مریشك | |
| | مر ــ ئاوی | مراوی | |
| ٣ ــ | حوشتر | وشتر | بە پێی زاری سولەیمانی و شارەزوور ـ لە هەورامان |
| | هوشیار | وشیار | |
| | ئەسب | هەسب | ( زاری شارەزوور ) |
| | کیلۆ (٥٠) | چیلۆ | ( زاری سولەیمانی و هەولێر ) |
| | دایکت | دایکد | = /د/: سولەیمانی و هەورامان و شارەزوور |
| | باوکت | باوکد | |
| | صەگت | صەد | |

لە کۆمەڵە وشەکانی بەشی یەکەم ، لە گۆ کردندا هەندێ دەنگ قرتاوە ، بەڵام لە نووسیندا دەنووسرێن وە لـە هەندێ زاریشدا ، بـە نووسین و گۆ کردن وەك یەکن •

لە وشەی ( داردەست )دا ، دەنگی /ت/ کە ، لـە گـۆ کردندا قرتاوە (بە پێی زاری شارەزووریەکان و سولەیمـانی و جـوانـرۆ و هـەورامـان ) ، وە حتی واش هـەیە لـە نووسینیشدا نانووسـرێ •

**قرتاندنی ئەم جۆرە دەنگانەی پاشەوەی وشە ، کە وەکو دەنگی / ت /**

(٥٠) /کی/ : بە زاری سولەیمانی و هەولێر دەبێتە /چی/
وەك : کێرد ، دەبێە چێرد ( چێرد )
وە کیلۆ ، دەبێتە ( چیلۆ ) •



منتدى إقرأ الثقافي

**بێ ، دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی زمانەکە ، واتا لە زمانی کوردیدا باوە ، کە دوا دەنگی وشــە ئەگەر لــە دەنگــە کــەم دەنگــەکــان بێ دەنگی نــابێ ( گۆ ناکرێ ) وە بە تایبەتی ئەگەر دوو دەنگی کەم دەنگ ، لە دوای وشەوە ، کەوتنە شوێن یەکەوە ، وە وەختی واش هەیە دەنگ قووت ئەدرێ ئەگەر لە گەڵ ئەوەی دواوەی دژ بن بــە یەکتری لــە دروســت بــوون و دەرچوون دا ( دوور بن لە یەکتریەوە ) •**

لە کۆمەڵە وشەی دووەمدا نموونەکــان وشــەی لێکدراون و لــە کۆنەوە بوونەتە بە یەك وشە ، ئەگەر سەرنجێ بدەینە هەر یەکە لــەم دوو وشە لێکدراوانە ( واتا ئەگەر جیایان بکەینەوە ) دەبینین ، هەر یەکە جۆرە مانایەك ئەدات ، مانایەکی سەربەخۆ دوورە لەو مانایەی کە ئێستە بە جووتە ( بە لێکدراوی ) هەیانە •

بە هۆی بەسەر چوونی دێر زەمانێکدا بە سەر یەکگرتنی هەندێ وشەی لێکدراو ، دەنگێك یا چەند دەنگێک سواوەو شوێنەواری نەماوە ، ئەم جۆرە شتانە سروشتی‌یە بە نیسبەت هەموو زمانێکەوە ، وە ئەم جۆرە وشە لێکدراوانەش رۆژ بە رۆژ دەخرێتە سەریان بە هۆی فــرە بوونی باری ئاڵۆزاوی ژیان •

لە نموونەی سێیەم ، گۆڕانی هەندێ دەنگە ، لــە نووسین بــە دەنگێکی کە لە گۆ کردندا ، لام وایە ئەم جۆرە شتانەش لــە هــەمــوو زمانێکدا رووی داوە •

**هێــز (stress) : (٥١)**

هێز ، لە زمانی کوردیدا ، هەر وەکو چۆن فۆنیمێ دەگۆڕی بــۆ

---

**(٥١)** هێــز ( stress ) : :

هێز ، هەروەك ، زمانناسەکان ناو و نیشانیان هەڵداوە ، جۆرە ( گرتن )ێکە ، جۆرە ( هێز )ێکە ، یاخــود جۆرە ( گــیر )ێکــە ، =



منتدى إقرأ الثقافي

. . . . . . . . . . . .

---

=

دەخرێتە سەر بزوێنی بڕگە لە وشەدا ، وە بە زمانی مۆرفۆلۆجیست (morphologist) ەکـــاندا ، پــێی دەڵێــن : « بـەنـدی هێــز Superfixes » = .

هەروەك وتمان ، هێز ، ئەکەوێتە سەر بزوێن و بـەس ، واتـا بزوێن نی‌یە هێزی بە سەرەوە نەبێ ، بەڵام کەم و زۆری کەوتوە ، گـەر وشەی ( بەرە ) بە نموونە وەرگرین دەتوانین بە دوو جۆر ( گۆ )ی بکەین ؛ لە جاری یەکەمیاندا هێزی زۆر دەخەینە سـەر دەنگی چوارەم کە /ە/یە ، کە واتای ( نەوە ) ئەدات ، وە جـاری دووەمیشیان هێزی زۆر ئەخەینە سەر دەنگی دووەم کە دەنگـە بزوێنی /ە/یە ، وە مانای ( کردار )ی تیدایە ، وەك یەکێ ، بلێت :

« ئەو قەڵەمە بەرم » ، تۆش لە وەڵامدا ، دەڵێت : « بیبە » .

ئەم هێز گوێزانەوە ، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەوانی‌تر ، واتا دەنگـە بزوێنەکانی‌تر ، هێزیان بە سەرەوە نی‌یە ، بەڵکو زۆر نەبێ کەم هێزیان بە سەرەوە ئەمێنێ . کاری هێز :

**کاری هێز :**

هێز ، هەر وەك لەوە و پێش وتمان فۆنیمە لەبەر ئـەوە ، لـە جێگایەکەوە ، بۆ جێگایەکی کە وە بـە پێی کـەرەسـەی دەور و پشتی و یاسای دەنگی وشەکە یاخود رستەکە ، لەم نیشانەدا زۆر چالاك و کاریگەرە :

أ ــ گۆڕینی واتای وشە :

| | | |
|---|---|---|
| شێرە | /شێ رە/ | ( ناوە ) |
| شێرە | /ش ێرە/ | ئازایە ( ئاوەڵناوە ) |

لە ناوەکەدا ، هێزی زۆر وا بە سەر دەنگی چوارەمەوە کە /ە/یە ، وە لە ئاوەڵناوەکەدا هێزی زۆر وا بەسەر دەنگی دووەمـەوە کـە /ێ/یە .

ب ــ گۆڕینی واتای رستە ، وەك :

١ ــ رۆیشت . هەواڵ .

=



منتدى إقرأ الثقافي

. . . . . . . . . . . .

=

٢ ـ رۆیشت ؟ ؟ پرسیار ٠

٣ ـ رۆیشت ! ! سەرسامی ٠

لە نموونەی یەکەمدا ، هێز بە یەکسانی بەسەر هەموو دەنگە بزوێنەکانەوەیە ، لە بەر ئەوە ؛ وشەکە هەواڵە ٠ وە لە نموونەی دووەمدا ، هێزی زۆر وا بەسەر دەنگی دووەمەوە کە /ۆ/یە ، وە هەر وەك / ۆۆ / ئەمەی لێ هاتبێ وایە ، لە بەر ئەوە وشەکە بوە بە پرسیار ، بەڵام لە نموونەی سـێیـەمدا ، هێزی زۆر کەوتوەتە سەر دەنگی سێیەم ، واتا سەر دەنگی / ی / ٠ لە بەر ئەوەی بوو بە وشەی سەرسامی ، بێ گومان بـەم هێز گـوێـزانـەوە ئاوازەکەشی دەگۆڕێ ٠

ح ـ گۆڕینی ئەرکی وشە ، یاخود رستە ، :

١ ـ ناو دەکات ، بە ئاوەڵناو ، وەك :

رەشە ( حەمەرەشید ) ناوە

رەشە / ڕە شە / : ئەوە : (رەشە)

مۆرە ناوە

مۆرە ئاوڵناوە ( ئەوە : مۆرە )

٢ ـ ( کردار ) دەگۆڕی بە ( ناو ) ، وەك :

بەرە ( کردار ) ( بەرە ) ( ناو ) ( واتا : ئەوە ) ٠

٣ ـ وشە دەشکێنێ ، وەك :

بێپایە ( بێبایەخ ) ( بێ پایە )

واتا ( بێ پێیە )

٤ ـ گۆڕینی ئەرکی رستە ، وەك ئەوەی (ب) ٠

٥ ـ گۆڕینی ئاوازە ( موسیقا )ی وشـە ، یاخـود رسـتە ، وەك ئەوەی (ب) ٠



منتدى إقرأ الثقافي

یەکێکی کە ، هەروەها ماناکەشی دەگۆڕێ ، وە وەنی یە ، هێز تەنها لە زمانی کوردی دا کاریگەر بێ ، بەڵکو لە هەموو زمانە هیندو ـ ئەوروپی یەکاندا وایە •

هێز ، نەدەنگ ون دەکات ، وە نە دەیقرتێنێ بەڵکو ئاوازەی فۆنیم دەگۆڕێ ( واتا دەنگی فۆنیمێ دەگۆڕێ ، بە دەنگێکی کە لە هەمان فۆنیم دا ، ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕینی مانای وشەکە ، یا فرەیزەکە • بە شێوەیەکی روونتر هێزی کەم و زۆر دانان لە سەر بزوێنێکی وشەوە گوێزانەوەی کەمی و زۆری ئەو هێزە بۆ بزوێنێکی کە ، لە هەمان وشە یا لە هەمان فرەیز دا ، دەبێتە هۆی گۆڕانی دەنگێك بۆ دەنگێکی کە لە گەڵ گۆڕانی واتادا •

**بۆ زیاتر رۆشن کردنە وە وا دانێ کە رەمزی هێز ( نووسینی بۆڵدە ) واتا ئەگەر بزوێنێکمان بە بۆڵد نووسی مانای ئەوە ئەدات کە هێزی وا بەسەرەوە :**

| وشە | ماناکەی |
|---|---|
| هەمانــە | کیسی گەنم کە لە چەرمی مەڕ و بزن دروست دەکرێ |
| هــەمانە | وەکو بڵێت : ئازوقەمان هەیە |
| کــەرە | مانای ( زبد )ی عارەبی دەدات • |
| کــەرە | مانای بێ عەقڵ دەدات • |
| رەشــە | ناوە ( رشید ) |
| رەشــە | رەش ( أسود ) |
| چوارتــا | ناوی شارێکی کوردستانە • |
| چوارتا | چوار ( تا )ی هەیە • |



منتدى إقرأ الثقافي

| مـانـاكـەی | وشە |
| --- | --- |
| ناوی دێیەكی كوردستانە • | قوڕگـە |
| بە عارەبی ( بلعوم )ی ، پێ دەڵێن • | قوڕگە |
| واتای ( شۆڕش )ی هەیە • | هەرا |
| واتا ، بێ دەنگ بە • | هـــەرا |
| ناوی ( گیایە )كە • | سێپەڕە |
| واتا (٣) پەڕەیی‌یە • | سێ‌پەڕە |
| واتا ، ( هەتاو ) نی‌یە ( سێ‌بەرە ) • | سێبەرە |
| واتا چوار بەری نی‌یە سێ‌بەرە • | سێ‌بەرە |
| نەوە • | بەرە |
| بەر بە واتای ( ثمر )ی عارەبی •<br>یا خود ( فرمانە ) بە واتای ( ببیە ) • | بـــەرە |
| جۆرە خواردنێكە كە لە هەویر و شـەكرو ڕۆن گوێز دەكرێ • | برمـــە |
| واتای قەبەو گەورە دەدات • | بیـرمە |
| مووروێكی رەشە ( یا حەیوانێكی خەیاڵی‌یە ) • | شەوە |
| واتا ڕۆژ نی‌یە ، شەوە •• | شەوە |
| واتا نۆرە | سەرە |
| واتا سەر ( رأس )ی عارەبی • | سەرە |



منتدى إقرأ الثقافي

تەماشا ، بزانە ، ( هێز ) چە کارێگەرێکە لەم شیعرانەدا :

داخی حەسرەت نەخشی‌کرد ئەمساڵ لە تەختی سینەما
بۆ ئەوانەی رائەکەن سەربەست ئەچن بۆ سینەما •
( زیوەر )

چەژنی قوربانە بەقوربان نۆبەتی قـوربانی‌یـە
بۆ تۆ قوربانی بە قوربان گیانی من قوربانی‌یە
( شیخ مارف )(٥٢)

هەر وەکو زانیمان ، کە زوربەی هێزی سەر وشە کەوتوەتە سەر بزوێنی وشەکەوە ، هەر وەها هێزەکانی سەر رستەش کـەوتوونەتـە سەر بزوێنی وشەکان و مـاوەی نێوانیان و بـەرز و نزمی سـەرانسەری ئاوازەی رستەکە •

هێزی سەر وشە ، یاخود هی سەر رستە ، هەر وەکو لە گۆ کردن‌دا بە جوانی دەر دەکەوێ ، لە نووسین دەر ناکەوێ ، مەگەر یەکێ بتوانێ دەریخات ، کە زۆر شارەزایی هەبێ لە زمان ناسی‌دا •

زمان ناسە رۆژ ئاوایی‌یەکان ، تـەقالای زۆریان داوە کـە بتوانن ، وێنەی رستەی زیندوو ( رستەی دەمی ) بگرن ، بەڵام ، من وا ئەزانم ، کە نەگەیشتوونەتە ئامانج ، چونکە زۆر کەم کەس بە هۆی ئـەو جۆرە شتانەوە فێری زمانی زیندوو ئەبن • ئەمانە لـە جێگایەکی تـرەوە بـە درێژی باس دەکەین :

**ئەندامەکانی ئاخاوتن (Organs of Speech)**

بـۆ ئەوەی بە جوانی و راستی و رەوانی بتوانین نـاو و نیشـانی

---

(٥٢) داوای لێ بوردن ئەکەم ، چونکە نازانم ئەم شیعرە هی (شێخ مارف)ە یا( مەلامارف )ە ، ئەمەی کە نووسیومە ، برادەرێک دایمێ بە بێ ئەوەی بتوانم رۆشنی بکەمەوە



منتدى إقرأ الثقافي

دەنگەکان هەڵدەین ، وا باشترە کە شتێ لە بابەت ئەندامەکانی ئاخاوتنەوە بزانین ( ئیشی هەر یەکەیان روون بکەینەوە ، کە وەکو چۆنیەتی بەشداربوونی و رادەی بەشداربوونی لە دروست کردنی دەنگێ یا چەند دەنگێدا ) • لەبەر ئەوە وا لێرەدا کورتە ناو نیشانێکی هەر یەکە لەوانە هەڵدەدەین :

١ ــ سی‌یەکان (The lungs)

سی‌یەکان دوو لوولەی ئەسفەنجی رەنگن پڕن لە لوولەی ورد ورد ورد ورد ورد هوایی ، وە هەر یەکە لەوانە ، بەستراوە ، بە لوولەیەکی کرۆچەنەیی‌یەوە وە ئەم دوو لوولەیە دەبنەوە بە یەك وە لوولەیەکی گەورە دروست دەکەن ، کە پێێ دەوترێ بۆڕی هەوا (القصبة الهوائية)•

٢ ــ بۆڕی هەوا (The Trachea) :

بۆڕی هەوا ، ئەو لوولەیە ، کە دروست بوە لە ئەڵقەی ناتەواوی کرۆچەنەیی ، کە سی‌یەکان دەبەستێ بە قورگەوە •

٣ ــ کش‌کشاکە (The larynx) :

بە بەشی هەرە سەرەوەی بۆڕی هەوا دەڵێن کش کشاکە ئەم بەشە پێك هاتوە لە ئەڵقەی گەورەتر لەو بەشەی یاخود لەو ئەڵقانەی کە بەشی خوارەوەی لێ دروست بوە ، ئەم بەشە پڕە لە ژێی دەنگی •

٤ ــ ژێیە دەنگی‌یەکان (The Vocal Chords) :

ژێیە دەنگی‌یەکان ، پێك هاتون لە دوو چەپکە تاڵە دەزووی گۆشتینی وردی سەر بەرەوخواری ریز کراو • بە ماوەی نێوانی ئەم دوو چەپکە ژێیە دەنگی‌یانە دەوترێ ماوای زمانە بچکۆلە (The glottis) . ئەم دوو چەپکە ژێیە دەنگی‌یانە ، لە کاتی هەناسەداندا دەکرێنەوە ، وە لە کاتی چفە کردندا وەك دابخرێن وایە ، لەگەڵ



منتدى إقرأ الثقافي

مانەوەی نەختێ بۆشایی بۆ چوونە دەرەوەی هەوا ، بـۆ ئەوەی ببێتـە هۆی لەرینەوەی ئەو ژێیە دەنگی‌یانە ، بۆ دەرچوونی دەنگ ، بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە تەماشای نەخشەی ئەم ژێیە دەنگی‌یانە بکە :

لە ژمارە ( A ) دا ژێیە دەنگی‌یەکان کراونەتەوە •

وە لە ژمارە ( B ) دا ژێیە دەنگی‌یەکان دا خراون •




G Glottis
V Vocal cords

٥ ـ گەروو (The Pharynx) :

لوولەیەکی گۆشتینی ئەوتۆیە ، کە یۆڕی هەواو بۆڕی خواردن دەگەیەنێتە بە ناو بۆشایی دەم و لووت • بە بەشی‌نزیک دەمی دەوترێ بەشە گەرووی لای‌دم (Oral pharynx) وە بە بەشە گەرووی لای لووت دەوترێ گەرووی لای لووت (nasal pharynx) .

٦ ـ بۆشایی لووت (The Nasal Cavities) :

بۆشایی لووت ، ئەو بۆشایی‌یە یە کە کەوتوەتە بانی عـاسـمانـەی دەم ، لەپێشەوە دەنووسرێ بە هەردوو کونەلووتەوە ، وە لە دواوە بە بەشی سەرەوەی مەلاشووی دواوە و دەمەوە •



منتدى إقرأ الثقافي

**٧ ـ دوا مەلاشوو (The Uvula)**

دوا مەڵاشوو ، بەو سووچەکەڵە دواوەی مەڵاشوو دەڵێن کە لـە دوای دواوە شۆڕ بوەتەوە بە سەر قورگ و زمانە بچکۆلەدا •

**٨ ـ زمـان (Tongue) •**

ئەو پارچە گۆشتە ماسۆلکەیی‌یەیە کە لە ناو بۆشایی دەمدا ، بـە ئاسانی جموجۆڵ ئەکات وە لە کاتی پشـوو دانیا ، نـاو تـەختی دەم پڕ دەکات ، زمان دەکرێ بە سێ بەشەوە :

أ ـ بنی زمان (dorsum)

ب ـ ناوەڕاستی زمان (The base)

حـ ـ سەر نووکی زمانی (The Tip of the Tongue)

**٩ ـ دانەکان (The Teeth)**

لە هەر کاکیلەیەکدا نزیکەی (١٦) شـانزە دان هـەن ، وەئـەم دانانەش سێ جۆرن :

أ ـ هاڕەر : (premolars)

ب ـ بڕەر : (incisors)

حـ ـ کەڵبە : Canines)

بڕەرەکان ، لە هەموویان بە سوود ترن ، لە یارمەتی دانی دەنگ دروست کردندا •

**١٠ـ مـەلاشوو ( عـاسـمـانـەی دەم ) (The roof of the mouth)**

مەڵاشوو یاخود عاسمانەی دەم دەکرێ بەم بەشانەی خوارەوە :

أ ـ هەرێمی بن دان (The dental region)

ب ـ پووك ( هاروو ) (The ginival region)



منتدى إقرأ الثقافي

حـ ـ ئەختی دان (The Alveolar ridge)

د ـ ناوەڕاستی مەلاشوو (The hard palate region)

هـ ـ شۆڕە مەلاشوو (The velar region)

**١١ـ لێـو (The lips)**

لێوەکان ، ئەو دوو پارچە گوشتینەن کە پێک هاتون لە ماسۆلکەی دەزوینی گۆشتی تێکەڵ و پێکەڵ کە دەوری دەمی‌یان داوە ، وە یارمەتی دروست بوونی زۆر دەنگ دەدەن ، بۆ نموونە وەك دەنگەکانی /ب/ ، /پ/ • جگە لەوەش دەورێکی باڵایان هەیە لـەکاتی دروست بـوون و دەرچوونی دەنگە بزوێنەکاندا ، وا لە خوارەوە بە چوار شێوە ، نەخشەی لێوەکان دەکەین :(٥٣)

١ ـ لە نەخشەی ( a ) دا کراونەتەوە

٢ ـ لە نەخشەی ( c ) ، ( d ) دا لێوەکان خڕن

٣ ـ لە نەخشەی ( b ) دا لێوەکان لە باری ئاسایی‌دان




(٥٣) بۆ ئەم نەخشانە خۆمان بە قەرزای ئەم سەر چاوەیە دەزانین :
An English Phonetics Course, Paul Christophersen



منتدى إقرأ الثقافي

**دەست نیشان کردنی دەنگە ئاوازەدارەکان**

لە باسەکانی پێشەوەدا ، ئەختێ لە ئەندامەکانی ئاخاوتن دواین ، وە بۆ زیاتر رۆش بوونەوە ، وا نەخشەیان پیشان دە دەین ، جا ئەوەی کە زۆر پێویست بێ ، لێرەدا ئەوەیە ، کە چۆن ناو و نیشانی هەر یەکە لەو دەنگەئاوازە دارانە هەڵدەدەین :




**جێگای دروست بوونی دەنگە ئاوازە دارەکان :**

دەنگە ئاوازە دارەکان (Consonants) ، بەپێی جێگای دروست بوونیان (Point of Articulation) دەکرێن بەم بەشانەی لای خوارەوە :

**١ ـ دەنگەکانی سازگەی هەردوو لێو (bal-Labial)**

ئەم دەنگانە بە یارمەتی لێوی سەرەوە و لێوی خوارەوە دروست دەبن ، وەك دەنگەکانی :

/ب/ ، /پ/ ، /م/ ، / ڤ / (٥٤)

---

(٥٤) ئەم دەنگە / ڤ / ، نیمچە بزوێنە ، وە زۆر دوورە لەوە وە کە بە تەواوی ( ئاوازە داربێ = Consonant) وەك هەندێ وتوویانە ، بەبێ ئەوەی وترابێ لە بەرچی ؟



منتدى إقرأ الثقافي

**ب ـ دەنگەکانی سازگەی لێو و دان (Labio-dental)**

ئەمانە ئەو دەنگانەن کە بە هۆی لێوی خوارەوە و دانەکانی سەرەوەی پێشەوە دروست دەبن ، وەک دەنگەکانی : /ف/ ، /ڤ/ •

**ح ـ دەنگەکانی سازگەی دان (dental)** •

ئەم دەنگانە بەهۆی سەر نووکی زمانەوە بەرامبەر بە دانە سەرووەکانی پێشەوە دروست دەبن ، وەك دەنگەکانی :

/ث/ ، /ذ/ (٥٥)

**د ـ دەنگەکانی سازگەی پووك ( هاروو )**

ئەم دەنگانە ئەوانەن ، کە بەهۆی سەر نووکی زمانەوە بەرامبەر بە هاروو ( پووك ) دروست دەبن ، وەکو دەنگەکانی :

/ت/ ، /د/ ، /ن/ ، /ل/ ، /ڵ/ ، /س/ /ز/ ، /ص/ •

لە دروست بوونی دەنگەکانی .

/ت/ ، /د/ ، /ل/ دا ، نووکی زمان لە بنی پووك دەدات ، وە لەوانی تر جێگایان نزم ترە •

**هـ ـ دەنگەکانی سازگەی مەلاشووی پێشەوە**

ئەم دەنگانە ، دروست دەبن بە هۆی دەمی زمانەوە ، بەرامبەر بە بەشی پێشەوەی عاسمانەی دەم ، لەگەڵ بەرز بوونەوەی بەشی زۆری لەشی زمان ، وەك دەنگەکانی :

/چ/ ، /ج/ ، /ش/ ، /ژ/ •

---

(٥٥) جگە لەوەی ، کە ئەم دەنگانە بوون لە زمانی ئاوێستادا ، وە جگە لەوەی لە زاری هەورامیدا هەر ماون ، ئێستەش وەك بۆمان هاتبێ ئەوە وایە چونکە خوێندەوارن ، زور بە باشی فێری گۆ کردنی بوون بە هۆی ( تەنسیری ) کالجەری عارەبییەوە •



منتدى إقرأ الثقافي

**و ـ دەنگەکانی سازگەی تەختیدان (Post-alveolar)**

ئەم دەنگانە بە هۆی سەری زمانەوە بەرامبەر بە بن (پووك)ی دانەکانی پێشەوەی سەرەوە دروست دەبن ، وەك دەنگەکانی :

/ر/ ، /ڕ/ ، /رپ/ ، /ڕڕ/ ، /ڕر/ .

**ز ـ دەنگەکانی سازگەی بنی زمان لەگەڵ بەشی دواوەی عاسمانـەی دەم .**

لە دروست بوونی هەندێ دەنگدا ، زۆر کەم دەم دەکرێتەوە ، وە نەختێ لەشی زمان جووڵەیێ دەکات وەك نەختێ بەرز بێتەوە وایە لەگەڵ جووڵەیەکی کەمی قورگ و مەلاشووی شۆڕدا وەك دەنگەکانی :

/ ك / ، / گ / ، / نگ / .

**ح ـ دەنگەکانی زمانە بچکۆلە (Glottal) .**

ئەم دەنگانە ، ئەوانەن کە لە ماوەی میانەی دواوەی زمان و زمانە بچکۆلەدا دروست دەبن وەك دەنگەکانی :

/ ھ / ، / ق / ، / ئـ / ، / ع / ، / خ / ، / ح / . .

**شێوەی دەرچوونی دەنگەکان (Manner of Articulation)**

بە پێی چۆنیەتی دروست بوونی دەنگەکان و شێوەی دەرچونیان ، لەگەڵ چۆنیەتی ڕێگادان بە دەرچوونی نـاو سیـیەکـان ، دەکـرێن بـەم جۆرانەی لای خوارەوە :

**ا ـ دەنگی حنکاو (Stops-Plosives)**

ئەم جۆرە دەنگانە دروست دەبن بە برینی ڕێگای دەرچوونی هەوای ناو سییەکان ، بۆ دەرەوە وەبە شێوەیەکی کتوپڕی ئەنجا بەردانی ئـەو پەنگاوی هەوایە ، وەك دەنگەکانی :

/ پ / ، / ب / ، / ت / ، / د / ، / ك / ، / گ / ، / ق / .



منتدى إقرأ الثقافي

ب ـ دەنگی پرتاو (affricates) .

ئەم جۆرە دەنگانە لە سەرەتاوە وەکو خنکاوبن وان ئەنجا بە کتووپڕی دەر دەچنە دەرەوە ، وەک دەنگەکانی / چ / ، / ج / .

ج ـ دەنگی برناخی (Nasal).

ئەم جۆرە دەنگانە دروست دەبن ، بە هێنانەوەیەکی بۆشایی دەم و پاڵنان بە هەواکەی ناوییەوە بەرەو لووت ، وەك ئەم دەنگانەی خوارەوە :

/ م / ، / ن / ، / نگ / ، / خ / .

د ـ دەنگی شەکاوە (Fricatives)

ئەم جۆرە دەنگانە دروست دەبن بە تەسک کردنەوەی ڕێگای دەرچوونی هەوا ، بە جۆرێکی وا کە زۆر تەنگاو بکرێت و ببێتە هۆی شەکانەوەی دەنگەکە ، وەك ئەم دەنگانە :

/ ف / ، / ڤ / ، / ه / ، / ز / ، / س / ، / ر / ، /ڕ / ، /ژ / ، /ش / .

هـ ـ لادەنگ (Lateral)

ئەم جۆرە دەنگانە دروست دەبن بەهۆی بەرزبوونەوەی زمان و ماوەدان بە هەواکەی ناودەم کە بەم لاو بەو لای زماندا دەرچێت وەك :

/ ل / ، / ڵ / .

ناو و نیشانی دەنگە ئاوازە دارەکان :

(Description of Kurdish Consonants)

بە پێی ئەو باسانە ( باسی دەنگەکان و شێوەی دەرچوونیان و دەست نیشان کردنیان )ی کە لەمەو پێش کردمان ، دەتوانین ، ناو و نشیانی هەر یەکە لەو دەنگانە هەڵدەین :

١ ـ دەنگی / پ / :



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم دەنگە زۆر کەم دەنگە (Voiceless) ، دەنگی سازگەی لێوە ، خنکاوە •

٢ ـ دەنگی / ب / :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی لێوە ، خنکاوە •

٣ ـ دەنگی / ت / :

ئەم دەنگە زۆر کەم دەنگە ، دەنگی سازگەی دانە خنکاوە •

٤ ـ دەنگەکانی /:د/ ، /د/ •

ئەم دەنگانە ، دەنگدارن ، دەنگی سازگەی ( پووک )ن خنکاون •

٥ ـ دەنگی /ک/ :

ئەمە زۆر کەم دەنگە ، دەنگی سازگەی بنی دانو بەشی دواوەی عاسمانەی دەمە ، دەنگێکی خنکاوە •

٦ ـ دەنگی / گ / :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی بنیدان و بەشی دواوەی عاسمانەی دەمە ، دەنگێکی خنکاوە •

٧ ـ دەنگی / چ / :

ئەمە زۆر کەم دەنگە ، دەنگی سازگەی مەڵاشووی پێشەوەیە ، دەربازی کوپرییە ( پرتاو ) •

٨ ـ دەنگی / ج / :

ئەم دەنگە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی مەڵاشوی پێشەوەیە ، دەربازی کتوو پرییە •

٩ ـ دەنگی / م / :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی لێوەو دەنگێکی برناخییە •



منتدى إقرأ الثقافي

١٠- دەنگی / ن / :

ئەم دەنگە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی هارووە دەنگێکی برناخی‌یە .

١١- دەنگی / نگ / .

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی بنی زمانەو بەشی دواوەی عاسمانەی دەم ، دەنگێکی برناخی‌یە .

١٢- دەنگەکانی /ل/ ، /ڵ/ :

ئەمانە دەنگدارن دەنگی سازگەی ( پووك )ن ، لادەنگن .

١٣- دەنگەکانی /ر/ ، //ڕ/ :

ئەمانە دەنگدارن ، دەنگی سازگەی تەختێ دانن، دەنگی شەکاوەن.

١٤- دەنگی /ف/ :

ئەم دەنگە کەم دەنگە ، دەنگی سازگەی لێو دانەکانە ، شەکاوەیە .

١٥- دەنگی /ڤ/ :

ئەم دەنگە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی لێو - دانە ، شەکاوەیە .

١٦- دەنگەکانی /س/ ، /ص/ :

ئەمانە کەم دەگن ، دەنگی سازگەی هاروون ، شەکاوەن .

١٧- دەنگی /ز/ :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی هارووە ، شەکاوەیە .

١٨- دەنگی /ش/ :

ئەمە کەم دەنگە ، دەنگی سازگەی مەڵاشووی پێشەوەیە ، شەکاوەیە.

١٩- دەنگی /ژ/ :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی مەڵاشووی پێشەوەیە، شەکاوەیە .



منتدى إقرأ الثقافي

٢٠ـ دەنگی /هـ/ :

ئەم دەنگە کەم دەنگە ، دەنگی سازگە زمانە بچکۆلەیە ، شەکاوەیە •

٢١ـ دەنگی /ق/ :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی زمانە بچکۆلەو فورگە ، شەکاوەیە •

٢٢ـ دەنگی /ح/ :

ئەمە دەنگدارە ، دەنگی سازگەی زمانە بچکۆلەیە ، شەکاوەیە •

٢٣ـ دەنگی /خ/ :

ئەم دەنگە ، دەنگدارە ، دەنگی سازگەی زمانە بچکۆلەیە، برناخییە•

بەم جۆرەی سەرەوە ، لە سەربناغەی باسەکانی پێشوو ، دەتوانین ناو نیشانی دەنگەکان هەڵدەین ، بۆ زیاتر رۆش کردنەوە وا لە خوارەوە جێگای زمان پیشان دەدەن ،لە کاتی گۆ کردنی هەندێ دەنگدا(٥٦) •

ئەم دوانزە نەخشانەی خوارەوە جێگای زمان پیشان دەدەن لە کاتی گۆکردنی ئەو دەنگانەدا کە لەژێر هەر نەخشەیەکەوە نووسراوە •

---

(٥٦) بۆ ئەم نەخشانە خۆم بە قەرزاری ئەم سەرچاوەیە دەزانم :
An English Phonetics Course, Paul Christophersen Professor of English at University Collage, Ibadan, Nigeria



منتدى إقرأ الثقافي




وێنەی (٨) و (٩) جێگای زمان پیشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /پ/ ، /ب/ ، وە /ت/ ، /د/دا .




وێنەی (١٠) و (١١) جێگای زمان پیشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /کپ/ وە /گب/ و /ك/ ، /گ/دا .



منتدى إقرأ الثقافي




وێنەی (١٢) و (١٣) جێگای زمان پێشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /ف/ و /ڤ/ و /ث/ و /ذ/ دا ٠




وێنەی (١٤) و (١٥) جێگای زمان پێشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /س/ و /ز/ وە /ش/دا ٠



منتدى إقرأ الثقافي




وێنەی (١٦) و (١٧) جێگای زمان پیشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /م/ و /ن/دا ٠



وێنەی (١٨) و (١٩) جێگای زمان پیشان ئەدەن لەکاتی گۆ کردنی /نگ/ و /ل/دا ٠



منتدى إقرأ الثقافي

(20)



وێنەی (٢٠)جێگای زمان پیشان ئەدات لەکاتی گۆ کردنی /ج/دا ٠



منتدى إقرأ الثقافي

# مۆرفۆلۆژی (Morphology) (٥٧)

مۆرفۆلۆژی ، یاخود (وشه سازی) ئەو زانستەیە کە لە ( مۆرفیم = (morpheme) ی وشە ، دەکۆلێتەوە ، لـە رووی قـەوارە و ( form ) جۆرو مانایەوە •

مۆرفیم چیە ؟

مۆرفیم ، هەر وەکو زمان ناسە رۆژ ئاواییەکان نـاوو نیشانیان هەڵ داوە ، بە تایبەتی مامۆستا ( بلوومفیلد ) (Bloomfield) ، بریتییە لە : « بچووکترین پارچەی ( واتا ) داری زمان • »

---

(٥٧) ئـەو شتانەی کە پاڵیان بە منەوە نا بۆ دوان لە باسیوا ، نەبوونی شێوەیەکی ریز کـراوی رێکو پێکی ئـەم باسـە نـوێیـە لـەو نووسینانەی کە نووسراون لە بابەت زمانو رێزمانی کوردییەوە ، وە ئەوانەی کە ناوی پێشبەندو پاشبەندیان بردوە هەر وەکو من بزانمو بەرچاوم کەوتبێ ( مامۆستا توفیق وەهبیو د• مەکەنزیو د• عبداللە نەقشبەندی د• نەسرین فخـریو شیخ محمدی خـاڵو مامۆستا نوری علی أمین •••••••••• هتد )

ئەوەش شتێکی پرژو بەڵاو بوەو ، ودەتوانم بڵێم هیچ کامێکیان ئەم باسانەیان لە بەر رووناکی قەوارەی وشەو وشەسازی یـاخـود ( مۆرفۆلۆژی ) دا باس نەکردوە ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە هەندێ ( بەند ) هەیە لەم باسی مۆفۆلۆژییەدا ، کە هەر باس نەکراوە کـە ئـەوانیش ، وەکـو بەندی ( ناو بـەنـد = Infixes ) و ( گۆڕان = Replacives) و ( هێز = Superfixes) .

جا لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە ، تەقالام دا بۆ کـۆ کردنـەوەو رێزکردنو تەواوکردنی ئەم ( بەندانە ) لە ژێر ئالآی ( وشەسازی ) یا ( مۆرفۆلۆژی )دا •

لە پێش ئەوەی پرۆمە ناخی باسەکەوە ، زۆر بە پێویستی دەزانم بڵێم زۆر قەرزازی ئەو سەرچـاوانـەم کە لە سـەرەوە ، وە لـــە خوارەوە دەستم بۆراکێشاون •



منتدى إقرأ الثقافي

ئەگەر ، هاتوو ئەو پارچە واتا داری زمانە کرا بە دوو پارچەی ترەوە ، یاخود تاقە دەنگێکی لێ جیا کرایەوە ، ئەو کاتە هیچ کامێکیان ، یا یەکێکیان واتا نابەخشێ •

بۆ نموونە ، وشەی ( هات ) ، بچووکترین پارچەی ( واتا ) دارە ، وەهیچ کاتێک ناتوانین ، پارچەی تری لێ جیا بکەینەوە ، بە مەرجێ هەر یەکەیان ( واتا ) بە خش بێ •

وا ، دانێ کە وشەی ( هات ) کراوە بە دوو پارچەی وەک ( ها ) وە (ت)وە ؟ ئەگەر سەرنجێ بدەیتە هەر یەکە لەم پارچانە ، تێ دەگەی کە ئەگەر یەکێکیان ( ها ) واتا بەخشێ ، ئەوی تریان (ت) ، زرە ، ( بێ واتایە ) ، کەوا بو ئەم وشەی ( هات )ە ، مۆرفیمە ، چونکە ، بچووکترین پارچەی ( واتا ) دارە •

بۆ زیاتر رۆشن کردنەوە ، با ورد بینەوە لە وشەی ( هاتم )و بزانین لە چەند مۆرفیم پێک هاتوە !! وشەی (هاتم) پێک هاتوە لە مۆرفیمی ( هات )و ( ــ م ) ، واتا لە دوو مۆرفیم ، یەکێکیان مۆرفیمی فەرهەنگی یە ، واتا ، واتای لە فەرهەنگدا دەست دەکەوێ ، کە ( فرمانە = فعل ) وە هی دووەمیان ( ــ م ) مۆرفیمێکی رێزمانی یە(٥٨) ، واتا ، واتای (رێزمانی) هەیە ، کە ( راناو )ێکە و (٥٩) واتای ( من ) دەدات •

**جۆرەکانی مۆرفیم :**

مۆرفیم ، لە رووی قەوارەوە ، دەکرێن بە دوو جۆرەوە :

١ ــ مۆرفیمی ( سەرە ) یا خود ( root ) .

---

(٥٨) مۆرفیمێکی رێزمانی یە ، لە چوار چێوەی وشەی ( هاتم )دا •

(٥٩) مامۆستا مەسعود محەمەد بە درێژی باسی ( راناوی ) کردوە بروانە ( سورێکی خامە بەدەوری ( راناو )دا ــ مەسعود محەمەد گۆڤاری کۆڕ بەرگی دووەم •



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ مۆرفیمی ( بەند ) یاخود ئەفێکسی (affixes) .

مۆرفیمی سەرە ( root ) ، ئەو مۆرفیمەیە کە خۆی ، بە سەربەخۆیی ( واتا ) دەبەخشێ • وەك :

( چوون ) ، ( هات ) ، ( شار ) ، ( ژیر ) •

مۆرفیمی ( بەند ) یاخود ئەفێکسی ( affixes ) ، ئەو مۆرفیمەیە کە بەسەربەخۆیی خۆی واتا نابەخشێ وەك : ( ـ تر ) ، ( ـ ان ) و ( ـ ت ) ••• هتد

**مۆرفیمە ئەفێکسیەکان ( بەندەکان )**

دەتوانین ، مۆرفیمە ئەفێکسیەکانی ( بەندسازی ) زمانی کوردی ، بکەین بەم بەشانەی لای خوارەوە :(٦٠)

١ ـ پێش بەند ( پێشبەند ) (Prefixes) .(٦١)

٢ ـ پاش بەند ( پاشبەند ) (Suffixes) .(٦٢)

٣ ـ ناوبەند ( Infixes ) .(٦٣)

---

(٦٠) بۆ ریز کردنی ئەم مۆرفیمانە ، وە بەم جۆرەی سەرەوە خۆمان بە قەرزاری ئەم سەرچاوەیە دەزانین ، چونکە لە بەر رۆشنایی ئەو رۆیشتوین بە ریۆە •
Acourse In English Linguistics by Khalil L. Al-Hamash, ph. D. and Jamal J. Abdulla, M.A.

(٦١) مامۆستا توفیق وەهبی لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا (بەرگی ـ یەکەم ) لاپەڕە ( ٩ ـ ٢١ ) باسی پێش بەندی ( دە = ئە )ی کردوە لە ژێر ناوو نیشانی « پیتە ڤالبی ئە = دە » بۆ مەبەستی راستیو چەوتی بەکار هێنانی ( ئە ) لە زمانی کوردیدا •

(٦٢) دوکتور عبداللە نەقشبەندی لە پاشبەندی ( درا ) دواوە بۆ مەبەستی « مانا » • گۆڤاری کۆڕی زانیاری ( ل ١١٥ ـ ١٣١ ) •

★ ★ ★

(٦٣) هەر وەها د• نەسرین فەخری لە ( پێشبەندی ) ، ( ڤە ) وە پاش بەندی ( ـ وە ) دواوە بۆ مەبەستی ( مانا ) نەك بۆ مەبەستی ( وشە سازی ) وەلام وایە ئەو پاشبەندەی کە دوکتورە نەسرین =



منتدى إقرأ الثقافي

٤ ـ گۆڕان (Replacives) .

٥ ـ هێز (Superfixes) .

بەم پێنج جۆرە بەندەی سەرەوە دەوترێ ئەفێکسس یاخود بەندەکان لە ( بەندسازی )دا .

**مۆرفیمی پێش‌بەند (Prefixes :**

**١ ـ ( بم ـ ) ( بت ـ ) ، ( بی ـ ) ، ( بتان ـ ) ( بیان ـ ) .... هتد )** دەبنە پێش‌بەند لە کاتی دروست‌کردنی کرداری ( ناڕەبەق )دا . هەر وەکو مامۆستا توفیق وەهبی ناوی ناوە . ئەم جۆرە پێش‌بەندانە مۆرفیمی ڕێزمانین واتا مانای ڕێزمانی دەدەن وەکو ( من ، تۆ ، ئەو ...... هتد )

وە نموونەش بۆ ئەمە وەکو : « کاشکی **بمفرۆشتایە** »(٦٤)

**٢ ـ پێش بەندی ( ئە ـ ) یاخود ( دە ـ )** کە دەکەوێتە یاخود دەبێتە پێش‌بەندی ( فرمانی ـ دادێ ) ، وەک :

دەچم = ئەچم

دەفرۆشم = ئەفرۆشم

**٣ ـ پێش‌بەندی ( دا ـ ) ، ( هەڵ ـ ) ، ( سەر ـ ) ، ( را ـ )...هتد )** دەبنە پێش‌بەندی هەندێ فرمانی لێکدراو ، وە هەندێ چاوگ ،

---

=

فەخری وتوویەتی : لە ڕاستی‌دا ( ـ ەوە )یە ، نەک ( ـ وە ) ، هەر وە ها ( ڤە ـ ) زۆر جیاوازە لە ( ـ ەوە ) ، چونکە ئەمە ( ڤە ـ )یە پێش بەندە وە ( ـ ە وە ) پاش‌بەندە ، وە لە جێگای خۆی‌دا باسی دەکەین .

(٦٤) بتفرۆشتایە
بتانخواردایە
بمانکڕیایە
بیانکردایە



منتدى إقرأ الثقافي

وەك :

کردار | داکەوت ، دادەکەوێ
هەڵکەوت ؟ ( هەڵکەوت ) : هەڵدەکەوێ
سەرکەوت ؟ ( زۆر جار دەبێتە ناو )

چاوگ | داخستن ، کردار | ( داخرا )
راخستن ، | ( راخرا )

٤ ـ **ئەو پێشبەندانەی کە ( دژن ) بە یەکتری‌و** دەکەونــە پێش ناوەو دەیکن بە ( هەڤاڵناو )، کە ئەوانیش ئەمانەن : ( بە ـ ) وە ( بێ ـ ) ، وەکو :

بێ‌هێز = ( لاواز )

بــەهێز = ( زۆردار ، یاخود بەقوەت )

٥ ـ **پێشبەندی ( مە ـ )** ، **کە** زوربەی وەخت بۆ ( ئاموژگاری ) بەکار دەهێنرێت ، وە هەندێ جاریش بە ( فەرمان = أمــر ) بــەکــار دەهێنرێت ، وەکو :

زۆر مەخۆرەوە

دوا مەکەوە !!

بە خۆڕایی لە دەستی بەر **مەدەن** ئەم خاکە شیرینە

( أحمد مختار جاف )

٦ ـ **پێشبەندی ( نا ـ )** ، کە زوربەی وەخت ( قسەکــەر = متکلــم ) بەکاری دەهێنێ ، بۆ نەکردنی ئیشێك ، کە بە دڵی نیە ، وەك :

ئەم وەڵامانە :

**ناڕۆم !**

درۆ **ناکەم !**

لە پاش ملە ، پاسی کەس **ناکەم !**

٧ ـ **پێشبەندی ( ما ـ )** ، ( مان ـ ) ، ( دەڵە ـ ) ۰۰۰ هەندێ نــاوی



منتدى إقرأ الثقافي

گشتی دەکەن بە ( مێ )وە پێش‌بەندی ( نێرە ـ ) تاک‌و تەراک ناوی گشتی[٦٥] دەکات بە ( نێر ) ، وەکو :

ماکەو ، مانگا ، دەڵەورچ

نێرەکەو ، نێرەورچ

٨ ـ **پێش‌بەندی ( بـ ـ )** ، کە دەکەوێتە پێش کرداری داخوازی‌یـەوە وەکو « **بخوێنن** چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تێغی دوژمنتانە »

« هەموو ئان‌و ساتێ چەشنی **قەڵغان**و سوپەرتانە »

( أحمد مختار جاف )

« **بنووسە** ، **بپرسە** ، مەترسە چەند دێڕێ شیعری جوانت بەسە »

( گۆران )

٩ ـ **پێش بەندی ( ڤە ـ )** [٦٦] ، کە لە زارە کوردیەکـانی ژووروودا بەکار دەهێنرێت ، وەک :

ڤەخوارن ( خواردنەوە ـ بۆ ئاو .. )

ڤەکرن ( کردنەوە ـ بۆ دەرگا )

**مۆرفیمی پاش‌بەند (Suffixes)**

ئەوەی کە من بیزانم ئـەوەیە ، کـە زوربـەی ئـەم مۆرفیمـە ـ پاش‌بەندانە ، لەم جێگایانەی خوارەوەدا ، دەر دەکەون :

---

(٦٥) مامۆستا نوری علی أمین ئەم پێش بەندەی بـە کارهێناوە لـە ژێر ناوی ( پیتە پێشگر ) بۆ مەبەستی گۆڕینی ناوی گشتی بۆ ( مێ ). وە لە ژێر ( جینسەکانی ناو )دا ، ریزی کردوە ، ل (٦٦ ـ ٦٧ ) ، ( ریزمانی کوردی ١٩٦٠ )

(٦٦) هەندێ جار پێش بەندی ( ڤە ـ ) لـە مانادا وەکو پـاش‌بەندی ( ـ ەوە ) وایە ، وە زۆر جاریش جیاوازی هەیە .

ڤەگەڕان : ( گەڕانەوە ) .

ڤەگێران : وتنەوە بەشوێنی‌دا ـ بۆ گۆرانی )

ڤەگێر : وتنەوە بۆ جاری دووەم ( ردّ ) . ( فاروقە نامیدی )

ڤەکوشت : سەری‌بڕی ( ذبح ) .

ڤەکوشتەڤە : دیسان سەری بڕیەوە .



منتدى إقرأ الثقافي

١ ـ **پاشبەندی ( ـ ێ )**وە ( ـ ێک ) ، کە یەک واتایان هەیەو یەک جێگاشیان هەیە ، وە بە مەبەستی ( واتا ) ، واتای ( تاک = مفرد ) دەدەن ، وەکو :

« نەورۆز بوو **ئاگرێکی** وەهای خستە جەرگەوە »

( پیرە مێرد )

٢ ـ **پاشبەندی ( ـ ە )** کە دەکەوێتە پاشکۆی ( ناو ) یاخود ( هەڤاڵناوە )وە ، وەکو :

ئەم **نیزامە کۆنە** تاکەی ؟ هیمەتێ کەن لابرێ »

( بێ کەس )

وختێ واش هەیە ، کە ئەم جۆرە پاشبەندە ،( هەڤاڵناو ) دەگۆڕێ بە ( ناو ) ، وەک : (٦٧)

چاک ( هەڤاڵناو )　　　　چاکە ( ناو )

٣ ـ **پاشبەندی ( ـ ەکە )** ، ( ـ کە ) ، ( ـ کەش ) ، ( ـ ەکەشی ) کە ئامرازن ، بۆ ناسینی شت بەکار دەهێنرین ، وەکو :

( ـ کە )　　　　**ماواکەمان** گیراوە ٠

( ـ کە )　:　**زمانەکەی** ئاوێستا مردووە ٠

( ـ ەکەش )　:　**پیاوەکەش** هاتەوە ٠

( ـ ەکەشی )　:　**کتێبەکەشی** کری ٠

٤ ـ **پاشبەندی ( ـ دا )** ، کە واتای ( لەگەڵ ) دەدات ، هەروەها بەکار دەهێنرێت لەگەڵ ( لەگەڵ )دا ، ئەگەر ویستمان رستەیەک ، بەهێز کەین و دڵنیایی تیادا ، دەرخەین ، وەکو :

« بچۆ سەر گردی یارە بیبینە لە**جیهاندا** گوڵێکی رەنگینە »

( پیرە مێرد )

---

(٦٧) شل : شلە ؛ کەچ : کەچە ؛ میل : میلۆک ( مەچەک )



منتدى إقرأ الثقافي

**لەگەڵ نەریماندا** ، چووم بۆ ڕاو • ( وەڵامە )

٥ ـ **پاشبەندی ( ـ ۆك )** ، لەم جێگایانەدا دەبینرێ :

أ ـ زۆرکەم ڕەگی فرمان دەکات بەناو ، وەك :

خش ( ڕەگ )      خشۆك ( ناو )

ب ـ بۆ بچووك کردنەوە ، وەك :

گرد      گردۆك ( گردۆلکە )

ح ـ گۆڕینی ناوێ بە یەکێکی کە ، وەك :

نارنج      نارنجۆك

میل      میلۆك ( مەچەك )

٦ ـ **پاشبەندی ( ـ ی )**(٦٨) ، کە لە ڕووی ئەرکەوە ، بە ئامرازی ( اضافە ) دەژمێرێت ، وەکو لێرەدا دەر دەکەویت ، وەك :

« **شاعرانی** کورد ! بەسە ، بەس باسی زولفو چاو بکەن
کەم خەیاڵی پەررچەمو کاکۆڵی ئاڵۆزاو بکەن »

( احمد مختار جاف )

« **زەمزەمەی بولبولی** بەهارانی

وردە **بارانی** ژێر **دەوارانی** »

( پیرە مێرد )

٧ ـ **پاشبەندی ( ـ م )** و ( ـ مان ) و ( ـ یان ) ، ( ـ تان ) و ( ـ ت ) ، ( ـ ن ) کە لە ئەرکدا ڕاناوی لکاون ، دەبنە پاشبەندی ( ناو ) یاخود ( فرمان ) ، وەك :

---

(٦٨) پاشبەندی ( ـ ی ) لەم جێگایانەدا ، دەردەکەوێ :
آ ـ لەتێپەڕ و تێنەپەڕی ڕابوردوو ، تاکی سێیەم ـ بردی ، بڕی •
ب ـ ڕابوردووی تێپەڕ بۆ ( دووەم )ی تاك ـ هاتی ، ڕۆیشتی •
ح ـ بۆ دروست کردنی ( ناوی واتا ) خۆش ـ خۆشی •



منتدى إقرأ الثقافي

( ـ م ) = من :           « ناوم .... ناوم
ئاوی تینوم . »
( شێرکۆ بێکەس )

( ـ مان ) = ئێمە :
« مێژووومان بە خوێن سوورە ...
( شوکت هۆشیار )

( ـ یان ) = ئەوان :
« رەک مانگی جێژن لێیان دەڕوانێ
پێیان هەڵدەکوت بەستەو گۆرانی »
( هێمن )

( ـ ت ) = تۆ :
بە یەک بوون ئەبێ گەلت پێش کەوێ )
( گۆران )

( ـ ن ) = ئێوە :
« لە خەو هەستن درەنگە میلەتی کورد خەو زەرەرتانە »
( احمد مختار جاف )

٨ ـ **بۆ چاوگ دروستکردن** لە رەگی فرمان ، زوربەی وەخت ئەم پاشبەندانە بەکار دەهێنرێن :

| **پاشبەند** | **رەگی فرمان** | **چاوگ** |
|---|---|---|
| ( ـ ان ) | پێو | پێوان |
| ( ـ ین ) | هەڵواس | هەڵواسین |
| ( ـ تن ) | خەو | خەوتن |
| ( ـ دن ) | مر | مردن |
| ( ـ وون ) | بـ | بوون |

٩ ـ **پاشبەندی ( را = درا )**[٦٩] و ( راو = دراو ) و ( رێ = درێ )

---

(٦٩) مامۆستا د. عبدالله نەقشبەندی ، لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی یەکەم سالی ١٩٧٣ ، لاپەرە (١٢٧)دا ئەمەی نووسیوە :
« ئەگەر کردەوەی بێخاوەن لە سەر بناغەی دووکار دارژاندرابێ ، پاشکۆیەکەی دەبی ، یا « درا » یـان « درێ » بێ ، وەك : دوێنێ گۆشت برژاندرا ، ئیمڕۆش دەبرژێندرێ » .



منتدى إقرأ الثقافي

بەکار دەهێنرێت بۆ دەست نیشانکردنی فرمانێک کە فرمان کەرکەی شاراوە بێ ( مبنی للمجهول ) ، وەک :

| رستە | فرمان | رەگی فرمان |
|---|---|---|
| زەویەکە کێڵرا • | کێڵرا (کێڵدرا) | کێڵ |
| زەوی کێڵراومان نیە • | کێڵراو ( کێڵدراو ) | |
| زەویەکە دەکێڵدرێ • | دەکێڵرێ (دەکێڵدرێ) | |

١٠ـ **پاشبەندی ( ـ موە )** ، کە لە زۆر جێگادا بەکار دەهێنرێ ، وە بۆ زۆر چەشنە ( واتا ) ، وەک : (٧٠) (٧١)

« دەرگا لە خەیاڵی وشەی نیوە شەوم **نەکاتەوە** »

( شێرکۆ بێ کەس )

« ووتم بە بەختی خەواڵوو وەرە ئەتۆبی خوا

لەخەو هەڵستە زمانێ **بچینەوە** ئەولا »

« حاجی قادری کۆی »

١١ـ **پاشبەندی ( ـ ین )** ، کە ( ناو ) دەگۆڕێ بۆ ( ئاوەڵناو ) •

وەك :

زێڕ زێڕین

دار دارێن

ئاسن ئاسنین

قیر قیرین یالەقیر دروست کراوە یاخود قیراوی‌یە

ـ یان ( واتای ) ئاوەڵکردار دەگۆڕێ ، وەك :

دێر دێرین ( دووری دەخاتەوە )

زوو زووین ( نزیکی دە خاتەوە )

ـ یان ئاوەڵناو دەکات بەناو ، وەك :

نەرم نەرمین

ـ یان ناوێکی نوێ لە ناوی‌تر دروست دەکات ، وەك :

---

(٧٠) د• ن• ف ـ چاوگی بێ واتا •

(٧١) باشبەندی(ـ ەوانێ)لە زاری سولەیمانی‌دا هەیە کە زۆر جاربۆ دوو بارە کردنەوە بە کار دەهێنرێ وەك : گەڕایەوانێ ، خواردی‌یەوانێ



منتدى إقرأ الثقافي

| | | |
|---|---|---|
| شیر | شیرین | |
| شەرم | شەرمین | وەختی واش هەیە بە ئاوەڵناو دەدرێتە قەڵەم |

١٢ـ **پاش بەندی ( ـ دار )** و ( ـ اوی ) بەکار دەهێنرێت بۆ گۆڕینی ( ناو ) بە ( ئاوەڵناو ) وەك :

| | | |
|---|---|---|
| ( ـ اوی ) | دڕك | دڕکاوی |
| ( ـ دار ) | زۆر | زۆردار |

١٣ـ **پاش بەندی ( ـ مەنی )** هەندێ وشە دەکا بە ( ناو ) وەکو :

| | |
|---|---|
| خواردن | خواردەمەنی |

١٤ـ **پاش بەندی ( ـ ی)و( ـ ایی )** و ( ـ یی ) وە (ـ یەتی ) ، ئاوەڵناو دەکەن بە ( ناو ) ، وەکو :

| | |
|---|---|
| سووتو | سووتەمەنی |
| ئەستوور | ئەستووری |
| | ئەستوورایی |
| ئازا | ئازایی |
| | ئازایەتی |

١٥ـ **بۆ ( ریزی ژمارە )** دیاری کردن ، پاش بەندی ( ـ ەم ) و ( ـ ەمین ) بەکار دەهێنرێ ، وەکو :

| | |
|---|---|
| پێنج | پێنجەم |
| | پێنجەمین |

١٦ـ **پاش بەندی** ( ـ تر ) وە ( ـ ترین ) دەبنە پاشکۆی ( ئاوەڵناو ) لە کاتی بەراورد کردنی دووشت یا زیاتردا ، وەکو :

گەورە گەورەتر

گەورەترین

١٧ـ **دوو وشە** یا بتر لە دووشە دەبنەوە ، یا بوونەتەوە بە یەك بۆ دروست کردنی ناوێکی نوێ لە ( قەوارە ) و ( واتا )دا ، بەم ناوە دەوترێ ناوی لێکدراو (Compound Noun) . ئەو ( وشە )ی دواوەیان دەبێ بە ( پاش بەند ) وە ئەوی تریان دەبێ بە ( سەرە ) • ئەم جۆرە ناوە لێکدراوانە زوربەیان بەم جۆرە دروست دەبن :



منتدى إقرأ الثقافي

آ ـ ناو + ناو = ناو        وەک : (*)

هێشوەترێ

گوڵە بەرۆژە

دەمە شێر

هەورە تریشقە

لالۆعەباس

ب ـ ژمارە + ناو = ناو(٧٢)

وەک : شەصتپەڕ ( گوڵ )

سێپەڕە ( گیا )

چوارتا ( شار )

دەصالآن

ح ـ پێ + ناو = ناو

وەک : پێپۆش ( پێڵاو )

د ـ ئاوەڵناو + ناو = ناو

وەک : کۆنەماڵ

پیرەپیاو

پیرەمێرد

سپیدار

هـ ـ ناو + ئاوەڵناو = ناو

وەک : جلەکۆن

شەوبۆ ( گوڵ )

هەوارەکۆن ( دێ )

---

(*) Kurdish Dialect Studies, Mackenzie

دەم هەندێ لەم جۆرە ناوە لێکدراوانەی بەکار هێناوە ٠

(٧٢) دەتوانم بڵێم بۆ ئەم جۆرە شتانە قەرزاری مامۆستای زمانی کوردیم لە پۆلی شەشەی سەرەتاییدا ، کە مامۆستا کاردوخی بوو ، زۆر لە پەندی پێشینانو ناوی دوولانە وەکو ئەو ئەیوت ، فێری کردین٠



منتدى إقرأ الثقافي

**و ـ ناو + کەر = ناو**

وەک : یاریکەر
کڵاشکەر
راوکەر

**ز ـ ناو + چی = ناو**

وەک : رواچی
چایچی
کارگەچی

**ح ـ ناو + ستان = ناو**

کوردستان
شارستان

**ت ـ ناو + وان = ناو** ، وەک :

باغەوان ( باخەوان )
ئاشەوان
دارەوانا
کەزەوان ( شاخەوان )

**ی ـ ناو + گا = ناو** ، وەک :

زەماونگا ( زەماوەندگا ) ( جێگای شایی )
شیوەنگا ( جێگای شیوەن و زاری )
زانینگا | زانینگا | ( جامعـە )
زانستگا | زانستگا |

**ک ـ ناو + کەن = ناو** ، وەک :

کاریزکەن ( ئەوەی کە کاریز هەڵدەکەنێ )
کۆکەن | ئەو گیایەی کە وشک دەکرێت
| بۆ مەڕو ماڵات ٠



منتدى إقرأ الثقافي

**م ـ ناو + نامه = ناو** ، وەك :

شەرفنامە

وەسیەتنامە ( وەسیەتنامە )

تەلاقنامە

**ن ـ ناو + خانە = ناو** ، وەك :

قوتابخانە

مەیخانە

نانەواخانە

کەبابخانە

**س ـ ناو + خان = ناو** ، وەك :

فاتەخان ( نازناو )

محمودخان

**ع ـ ناو + گەل = ناو** ، وەك :

کارگەل

کوڕگەل

گاگەل

**ف ـ ئاوەلفرمان + ناو = ناو**

سەربان

سەرباز

ژێرپیاڵە

**ص ـ ناو + ژەن = ناو**

زورناژەن

شمشاڵژەن

تێرەژەن



منتدى إقرأ الثقافي

**و ـ ناو + دار = ناو**

نامدار

بریندار

باڵدار

**ر ـ ناو + بەن ( بەند ) = ناو**

کاشیبەند ( بەن )

تەلبەند ( سیمبەن )

مێخەکبەن ( ملیوانکە لە مێخەک )

**ش ـ ناو + فرمان = ناو**

کۆپاندروو

لیفەدروو

بوومەلەرزە

دەریالووش

کەوشدروو

**ت ـ ناو + ساز = ناو**

**تەنەکەساز**

دانساز

چەخماخساز

**ث ـ ناو + دۆز ( دۆس ) = ناو**

زیندۆز ( زیندۆس )

قەومدۆس

**خ ـ تێکە ڵاو ( هەمەجۆر ) :**

بەژنوباڵا[73]

دەموچاو

---

(٧٣) د. مەکەنزی ئەم نموونەیەی بەکار هێناوە بۆ ( ناوی لێکدراو ) .



منتدى إقرأ الثقافي

جێ‌وڕێ
تەنگ‌وچەڵەمە
مەرەزەجاڕ ( ئەو جێگایەی کە مەرەزەی لێ کراوە )

**مۆرفیمی ناوبەند** ( Infixes )

۱ ـ **ناوبەندی ( ـ دە ـ )** ، کە دەکەوێتە نێوان هەردوو بەشی ( فرمانی لێکدراوە )وە و دەیکا بە ( فرمانی دادێ ) ، وەک !

هەڵدەسێ ( هەڵدەسێ ) ( هەڵئەسێ ) ( هەئەسێ )[۷٤]
هەڵدەفڕێ ( هەڵدەفڕێ ) ( هەڵئەفڕێ ) ( هەئەفڕێ )[۷٥]
رادەوەستێ
پێوە دەبێ

۲ ـ **ناوبەندی ( ـ نا ـ )** ، کە دەچێتە نێوان هەردوو بەشی ( فرمانی لێکدراوە )وە ، وەک :

هەڵناسێ ( هەڵناسێ )
هەڵنافڕێ ( هەڵنافڕێ )
دانانیشێ
سەرناکەوێ
ڕاناگیرێ

۳ ـ **ناوبەند ( ـ ب ـ )** ، دەچێتە نیو هەردوو بەشی (کرداری لێکدراوە)و دەیکا بە فرمانی داخوازی ، وەک :

هەڵبسم ! ( هەڵسم = هەڵسم )
دابنیشم ! ( دانیشم ) ٠

---

(۷٤) بە زاری کوردی ناوەڕاستو زاری ژووروو ٠
(۷٥) نووسەر بە خواشتەرخوازی خۆی و چۆنی بۆ هات وا ئەم جۆرە وشانە دەنووسێ ٠



منتدى إقرأ الثقافي

یان دەبێ بە ( فەرمان = امر ) ، وەک :

هەڵبگرە　　　( هەڵگرە )

هەڵبسە　　　( هەڵسە )

٤ ـ **ناوبەندی ( ـ ب ـ )** ، کە دەچێتە نێوان هەر دوو بەشی کرداری لێکدراوەو لە کاتی دەرخستنی پەشیمانی بە شوێن کارێکدا کە نەبوەو ویستراوە بێ ، وەک :

کاشکی ، **سەربکەوتمایە**

خوزگە ، بەیانی زوو **هەڵبسامایە** ( هەڵبسامایە )

بریا ، **دەربچوویتایە**

٥ ـ **ناوبەندی ( ـ نە ـ )** ، کە دەچێتە نێوان کرداری لێکدراوەوە لە کاتی دەرخستنی پەشیمانی بە شوێن ئیشێکدا ، کە بووە ، وەک :

کاشکی ، **سەرنەکەوتایە !**

بریا ، **دەستی نەرۆیشتایە !**

٦ ـ **ناوبەندی ( ـ مە )** کە دەچێتە نێوان هەر دوو بەشەکەی کرداری لێکدراوەو دەیکا بە ( نفی ) ، وەک :

« **ڕامەکە** لە دووای کاری پرووپووچ

هەڵ ئەخلیسکێی لە پڕ لنگ و قووچ »

( پیرەمێرد )

**بەندی گۆڕان (Replacives) :**

دەست نیشان کردنی جێگای تایبەتی ئەم جۆرە بەندە ئاسان نیە ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ، لەم جێگایانەی خوارەوەدا دەردەکەون :

أ ـ گۆڕانی هەندێ ( پێش‌بەند ) بە ( پێش‌بەندی ) تر ، لە زارێکەوە بۆ یەکێکی کە ، بە بێ گۆڕانی مانا ، وەک :

ئەڕۆم　　　بە زاری ناوەڕاست ( ئە ـ )



منتدى إقرأ الثقافي

دەڕۆم به زاری سەروو ( دە ـ )

ب ـ یان به گۆڕانی ( پاش‌بەندێ ) له زارێکا ، به‌(پێش‌بەندێ ) له زارێکی تردا له‌گەڵ مانەوەیان لـه سـەر یـەک ( واتا ) ، وەک :

خواردنەوە به زاری ناوەڕاست ( ـ ەوە )
ڤەخوارن به زاری سەروو ( ڤـه ـ )

ح ـ یان به فڕێدانێ دەنگێ یا زیاتر له دەنگێ ، له کاتی ( کۆ )ی ناوێک‌دا ( له زاری هەورامی‌دا ) وەک:(٧٦)

پیا ( پیاو ) ← پیێ ( پیاوان )
دەگا ( دێ ) دەگێ ( دێیان )

**بەندی هێز (Superfixes)**

ئەم جۆرە بەندە زۆر جیاوازە لەوانی تر ( واتا له بەندەکانی تر ) ، بەوەی که به هیچ کلۆجێك لەوانەی پێشەوە ناکات ، وه به ئاوازەدا زیاتر هەستی پێ ناکرێ ، بەڵام دەتوانین ( رەمزێکی ) بۆ دابنێن ، ئەوەی له نووسین‌دا دیاری بێ ؟ وا لێرەدا تەقالا ، دەدەین که نەختێ ئەمە روون کەینەوە •

له باسەکانی ( دەنگ سازی )دا ، باسی ٛهێزمان کرد و وتمـان ، هێز ؛ له زمانی کوردی‌دا دەکەوێتە سەر بزوێن ( واتا ، هەر بزوێنێك ، هێزی بخرێتە سەر ، له هەر وشەیەك‌دا ، ئاوازەی ئەو بزوێنە دەگۆڕێ و واتاکەشی دەگۆڕێ ) •

---

(٧٦) لەمانەش زیاتر بەندێ گۆڕان هەن ( له زمانی کوردی ) ئەگەر به وردی بگەڕێن به شوێنیان‌دا •

دێ : دێیان | دەشڵێن : دیهات
میوە :خۆی،کۆیە| میوەهات
باغ (باخ) : باغان| باغات



منتدى إقرأ الثقافي

**١ ـ له وشه‌دا ، كه هێز ده‌كه‌وێته سه‌ر بزوێنه‌كانی‌و یه‌كێكیش له‌وانه، دوور نی‌یه ، كه زیاتر نه بێ یاخود به‌هێز تربێ له‌وانی تر ، وه‌ك :**

ژنه‌كـــه : مه‌به‌ست له ژنێكه كه هه‌ردوو لا قسه‌كه‌ر و گوێ گر ده‌یناسن •

ژنـــه‌كه : لێره‌دا مه‌به‌ست بانگ كردنه ، چونكی ناوی نازانرێ •

بـــه‌رماڵ : بۆ نوێژ له سه‌ر كردن به‌كار ده‌هێنرێت

به‌رمـــاڵ : به‌رده‌می ده‌رگای ده‌ره‌وه‌ی خانوو

**٢ ـ هێز له سه‌ر رسته :**

هێز ، ته‌نها به سه‌روشه‌وه ، یاخود بزوێنی وشه‌وه نی‌یه ، به‌ڵـكو سه‌رانسه‌ری ئاوازه‌ی رسته ده‌گرێته‌وه ( به‌ســه‌ر بزوێنــه‌كـانی وشه‌كان دا ، ماوه‌ی نێوانی وشه‌یه‌ك و یه‌كێكی‌تر دا ) ، وه‌ك :

( دوێنێ هاتی ) ئـه‌وه‌ی كـــه ده‌ڵێت ؟ بـرۆمــه‌وه بـاشــه هـاوه‌ڵـه‌كه‌شـی ده‌ڵـێـت : دوێـنـی هـــاتی هێـز بـه یـه‌كسـانی دابـه‌شـه‌بـه سـه‌ر بزوێنه‌كان‌دا •

**دوێنێ هاتی ؟(٧٧)**

لێره‌دا دوو هێزی قورس هه‌یه ، یه‌كه‌میان به سه‌ر ده‌نگی پێنجه‌می وشه‌ی یه‌كه‌مه‌وه ، دووه‌میـان بـه ســه‌ر ده‌نـگی چـواره‌می و شــه‌ی

---

(٧٧) ده‌روازه :

هێزی سه‌ر ده‌نگی حه‌وته‌م ، ئێجگـار زۆره ، وه واتـای ده‌رگـای هه‌ره‌گه‌وره ، یاخود گه‌وه‌ترین قاپی خانوو كه كه وتوه‌ته پێشـی پێشه‌وه‌ی خانوه‌كه‌وه •

به‌ڵام ئه‌گه‌ر هێزی زۆر له‌سه‌ر بزوێنی پێنجه‌مه‌وه بێ ، ئه‌و وه‌خته ئه‌و واتایه‌ی ســه‌ره‌وه نادات ، به‌ڵـكو واتای ( كراوه = ئاچوغ ) نه‌دات •



منتدى إقرأ الثقافي

( هاتی )یەوە ، بەڵام هی وشەی یەکەمیان زۆرترە ، وە ئاوازەی رستەکە لەوەی پێشوو جیاوازترە ، چونکە هی پێشوو ( راپۆرتە ) ، بەڵام هی دوایی ( پرسیارە ) • بۆ زۆرتر رۆشن بوونەوە تەماشای ئەم دێرە شیعرەی مامۆستا ( حریق ) بکە :

تاڵ و شیرین پێکەوە نەم دیوە چا بێ ، چا ، نەبێ
هەر کەسێکی هەم نشینی چا نەبێ پێت چا نەبێ
( حریق )



منتدى إقرأ الثقافي

## رسته سازی (SYNTAX) :

له پێش ئەوەی کە ناو و نیشانی رستە هەڵدەین ، وای بە باش دەزانین کە چەند نموونەیەك لە رستەی هەمە جۆر بهێنینەوە ، ئەنجا ئەگەر بەپێویست زانرا ، ئەو کاتە ، ناو و نیشانی رستە لە جەوهەری رستەکاندا ، دەر دەهێنین :

١ ـ ئاشتی داکەوت •
٢ ـ رووباك قوتابی‌یە •
٣ ـ شیرین وریایە •
٤ ـ رووناك بارۆکە دەکرێ •
٥ ـ یاری دەستی پێ کرد •
٦ ـ نەوزاد دەستی بە نووسین کرد •
٧ ـ لێرەوە دانیشە •
٨ ـ کەی هاتی ؟
٩ ـ نان خورا •
١٠ـ لەوێ دا مەنیشە •(٧٨)

---

(٧٨) دەتوانین ، ئەو دە رستەی سەرەوە ، بە کلێشەیان دانێین ، بۆ دروست کردنی رستە لە زمانی کوردی‌دا ، واتا بەم جۆرەی خوارەوە :

١) ـ ناو + فرمان ( کردار ) •
٢) ـ ناو + ناو + پاش بەندی ، یاریدەدەر ( کە وەکو فیعلی مساعیدی ئینگلیزی وایە : (Verb to be)
٣) ـ ناو + ئاوەڵناو + پاش‌بەندی یاریدەر وەکو ئەوەی سەرەوە
٤) ـ ناو + ناو + کردار ( فرمان ) •
٥) ـ ناو + کردار ( فرمان )ی یارمەتی‌دەر ( دەستی پێ کرد )
٦) ـ ناو + کردار ( بە + ناو)ی یارمەتی دەر
٧) ـ ئاوەڵکردار + کردار ( فرمان ) •
٨) ـ ئامرازی پرسیار کردن + کردار ( فرمان ) •
٩) ـ ناو + کردار ( مبنی للمجهول ) •
١٠) ـ ئاوەڵکردار + مە(نفی) + کردار •



منتدى إقرأ الثقافي

ئەگەر بە وردی تەماشای ئەو ( دە ) رستەیەی سەرەوە بکەین ، دەبینین ، کە هەر رستەیێ لەو رستانە دوو بەشە :

١ ـ بەشی یەکەمی رستەکە ئەوەیە ، کە وشەیەکی سەرە ، هەیە لە ناویا ، وە هەرچی وشەی تر هەن لە رستەکەدا ( جگە لەوشە سەرەکە ) ، هەموو دەس و پێوەندی ئەون[٧٩] •

٢ ـ بەشی دووەمی رستەکە ، بریتی‌یە لە تەواو کەری وشە سەرەکە ( هەواڵ هێنەری ، یاخود هەواڵ دەری ) •

بەشی یەکەم لە رستەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەمدا ، بریتین لە وشە کانی ؛ ( ئاشتی ) و ( رووپاك ) و ( شیرین ) و ( رووناك ) و ( یاری ) و ( نەوزاد ) • وە لە نموونەی حەوتەمدا وشەی سەرەمان نیە ، بەڵام راناوی ( تۆ ) کە شارراوەیە لە باتی وشە سەرەکەیە ، وە رستەکە هەمووی دەس و پێوەندەکەینی ( دەس و پێوەندی راناوە شارراوەکەن ) •

لە نموونەی هەشتەم و دەیەمدا ، راناوی ( تۆ ) کە شارراوەیە ، وشەی سەرەیە ، وە ئەوانی تر تەواوکەرن •

لە نموونەی نۆیەمدا ، ( نان ) وشەیەکی سەرەیە و ( خورا ) تەواوکەرە •

---

(٧٩) دەتوانین ، هەر یەکە لەو رستانە درێژ بکەینە وە ( بەناواخن کردنیان بە وشە ) بە مەرجێ هیچ لە بنیاتی رستەکە نەگۆڕێ ، وەك :

أ ـ رووپاك وریایە •

ب ـ رووپاك ، کچێکی بچکۆلە و زیرەك و بێ‌کەس و ، وریایە •

رووپاك : وشەیەکی سەرەیە •

ئەوانی تریش، بەشی دووەمی رستەکەن کە وە کوو هەواڵە ( تەواو کەرە ) •



منتدى إقرأ الثقافي

وە نیی‌یە ، لە زمانی کوردی‌دا ، تەنها ئـەو ( دە ) جـۆرە رستـە سەرەیە هەبن ، ئەگەر زیاتر سەرنج بدەینە زمانی کوردی ، لەوانەیـە بتوانین رستەی سەرەی تر بدۆزینەوە(٨٠)

**جۆری رستە :**

بە شێوەیەکی گشتی ، رستە لە زمانی کوردی‌دا دوو جۆرن :

أ ــ رستەی دەمی ( بەرەڵلا ) .

ب ــ رستەی نووسراو ( پڕ ) .

**رستەی دەمی :**

زوربەی رستە دەمی‌یەکان ، واتا نادەن ، ئەگەر نووسران ، وە ئەگەر لەگەڵ ئەو شتە پێویستی‌یانە نەبن ، کە دەبنە هۆی تەواو کردنیان . زوربەی رستەی دەمی ، وەك کورتە وەڵامی پرسیار بن وان ، بۆ نموونە

**١ ــ بەڵێ .**

**٢ ــ دوێنێ .**

ئەمانە ، هەر یەکەیان وەڵامێکە بـۆ پرسیارێك کـە لـەوەو پێش کراوە ، وەك :

( پرسیار ) : دەرچوویت ؟ وەڵام : بەڵێ .

(پ.) : کەی‌هاتی ؟ ( و. ) : دوێنێ .

---

(٨٠) تەماشای ئەم رستانە : بەخێر بێیت .
بە خۆشی بچیت .
جوان دانیشە .

کلێشەی ئەمانە ، ئەمەیە ؛ ئاوەلکردار + کردار ، وەك نموونـەی رستە سەرەی حەوتەم کە لەپێشەوە پیشـان درا . دوور نی‌یـە بوترێ ( جوان ) ئاوەلناوە ، بەڵێ راستە ، بەلام لێرەدا بۆ تاریفی کردار هاتوە ، لەبەر ئەوە بە ئاوەلکردار دەدرێتە قەلەم .



منتدى إقرأ الثقافي

گومانی تێدا نی‌یه ، که ئه‌گه‌ر بۆ ئه‌م تاکه وشانه ( به‌ڵێ ، دوێنێ ) ، پێشه‌کی‌یه که ، نه‌بێ به هیچ کلوجێك ، واتای رسته نادەن ، وه‌ختی واش هه‌یه ، جۆره ئیشاره‌تێکی ده‌ستی یا هه‌ندێ ئیشاره‌تی تری بـاو واتای رسته ده‌به‌خشن بۆ نموونه ، یه‌کێك ، نه‌ختێ لـه یـه‌کێکی کـه‌وه دووره ، نایه‌وێ به دنگه‌واز بانگی کا ، یاخـود نایه‌وێ که‌س بـزانێ ، ئیشاره‌تێکی ده‌ستی بۆ ده‌کات ، ئه‌ویش ده‌ست به‌جێ تێ ده‌گات کـه بانگ ده‌کرێ •

رسته‌ی ده‌می ، زۆر جۆری هه‌یه ، وه‌لام وایه ، زوربـه‌شیـان به‌شدارن له‌مانه‌دا :

١ ـ چاکی و چۆنی ، وه‌ك :

| | |
|---|---|
| چۆنی ، چاکی ؟ | سوپاس • |
| | زۆر سوپاس • |
| | باشم • |
| | زۆر چاکم • |

٢ ـ فه‌رمان دان ، وه‌ك :

أ ـ هه‌ڵسه ! برۆ !

ب ـ ئه‌رکه‌که‌ت جێ به‌جێ بکه •

حـ ـ دوا نه‌که‌وی !

٣ ـ ورده هه‌واڵ ، وه‌ك :

دوێنێ هاتی ؟

فلان چۆنه ؟

چی ؟

چۆن ؟

بۆچی ؟



منتدى إقرأ الثقافي

٤ ـ شتی دەمی تر •

ئای !!

راستە !

وایە !

ئاخ !

ئای ، لەوە !

ناء !

راستی راستی !!

**ب ـ رستەی نووسراو :**

هەموو ، رستەیەکی نووسراو ، دوو بەشە ، هەر وەك لەپێشەوە وتمان ! بەشی یەکەمیان وشەیەك یاخود شتێکی سەردیە وە بە شتێکی سەرەکی ئەژمێررێت لە رستەکەدا ، بەڵام بەشی دووەم بریتی یە لە هەواڵدەر یاخود تەواوکەری بەشی یەکەم •

رستەی نووسراو هەموو کاتێ ، واتایەکی تەواو و سوودبەخش دەبەخشێت ،وە نموونەش ئەوانەی سەرەوە بوون کە لە پێشەوە ( دە رستە سەرەکی یەکە ) پیشان دران •

بە پێی ئەو نموونە و جۆرانەی رستەکە لە سەرەوە پیشان دران دەتوانین بڵێین :

**رستە ، بە شێوەیەکی گشتی ، ئەوەیە کە گوێ گر لە فرمانەکەی تێ بگا ، ئیتر مەرج نی یە لەوەدا ، کە بە رواڵەت و شەیەك بێ یاخوو چەند وشەیەك بن •**

**رستە بە پێی ریزکردنی وشە :**

بە پێی ریز کردنی وشە لە رستەدا ، رستە دەکرێ بە دوو جۆرەوە :



منتدى إقرأ الثقافي

**١ ـ رستەی فەرماندار** " active " (٨١) ، وەك :

أ ـ شێرکۆ گۆرانی وت •

ب ـ ئەوان جلەکانیان شوشت •

حـ ـ ئازاد دەرگاکە بۆیە دەکات •

ئەگەر ، بە باشی تەماشای ئەم رستانەی سەرەوە بکەین ، دەبینین ، کـە هـەر رسـتەیێ لـەو رستانە **فرمانکەرێکی**(٨٢) هـەیـە ، وە ئـەو فرمانکەرانەش یـا ( نـاون ) یـا ( رانـاون ) وەك ، ( شێرکۆ ، ئازاد ، ئەوان،) ، هەر وەها وشەی سەرەشن • بۆ زیاتر رۆشن کردنەوە لە رستەی ( شێرکۆ گورانی وت ) ، ( شێرکۆ ) فرمانکەرە ( فاعل ) ، واتا ئەو ئیشەکە دەکات کە ئەویش ئیشی (گۆرانی وتنە) ، وە لـە رسـتـەی ( ئەوان جلەکانیان شوشت ) ، ( ئەوان ) ( فـرمانکەرە ) واتـا ئیشەکـە دەکات ، کە ( جل شوشتنە ) وە لە رستەی ( ئازاد دەرگاکە بۆیە دەکات )، ( ئازاد ) فرمانکەرە و ئیشەکە دەکات ؛ کە ( دەرگا بۆیە کردنە ) •

بە پێی ئەرکی سەرشانی هـەر وشەیێ لـە رستەدا ، دەتوانین ، کلێشە بکێشین بۆ هەر یەکێ لەو رستانەی سەرەوە :

بۆ نموونـەکـان ، هـەر سێکیـان ، لام وایـە بـەم جـۆرەیـە ( فرمانکەر + فرمانبەر + فرمان ) •

**ب ـ رستەی بێ فەرماندار** (Passive Voice) . (٨٣)

١ ـ گۆرانی وترا •

---

(٨١) ( رستەی فرماندار ) واتا رستەی (active-voice) .

(٨٢) فرمانکەر ( فاعل ) ، فرمانبەر ( مفعول بە ) •

(٨٣) تەماشای جیاوازی نیوان زاری سۆرانی و کرمانجی ژووروو بکە لە رستەی ( بێ فەرماندار‌دا = مبنی للمجهول ) •

| **سۆرانی** | **کرمانجی ژووروو** |
|---|---|
| پەنجەرەکە شکا • | ئەوپەنجەر هاتە شکاندن • |
| گۆشتەکە برژا • | ئەوگۆشت هاتە بژارتن • |



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ جلەکان شۆران •

٣ ـ دەرگاکە بۆیە دەکرێ •

لەم سێ رستەدا ، فرمانکەر ( فاعل )مان بەر چاو ناکەوێ ، واتا نازانرێ :

١ ـ کێ گۆرانی وتوە ؟

٢ ـ کێ جلەکانی شوشتوە ؟

٣ ـ وەکێ دەرگاکەی بۆیە کردوە ؟

بەکار نەهێنانی فرمانکەر ، لەم رستانەدا ، لام وایە ، دەگەرێتەوە بۆ ئەم چەند هۆیە :

أ ـ یا فرمانکەر زۆر بێفەرە ، پێویستی بەوە ناکات ، کە ناوی ببرێت •

ب ـ یا زۆر بزرگە ، ناوێرین ناوی بەرین •

ح ـ یا بۆ کورت کردنەوەی رستەکە •

د ـ یا لە بەر ئەوەی کەس پێی نەزانێ ( واتا ترسمان لە خەڵك هەیە ) •

**جۆری رستە بەپێی قەوارە :**

رستە بە پێی قەوارە دەکرێن بە دوو جۆرەوە :

أ ـ رستەی ساکار (Simple Sentence) .

١ ـ سەردار سەر سەرکردەیە •

٢ ـ شۆرش سەرکەوت •

٣ ـ زەوی هی جووتیارە •

٤ ـ ئەوان لە خەو هەڵدەسن •

٥ ـ من و ئازاد لە سەر هەورە بانەکەی خۆمان ، دوێنێ نیوەرۆ ، بە قرچەی گەرما ، بە رووتی ، دانیشتبوین •



منتدى إقرأ الثقافي

تەماشایەکی ئەم رستانەی سەرەوە بکــە و بزانــە ، هــەر رستەی چەند ( فرمان )ی تێدایە ؟ لام وایە ، هەر رستەیێ ، لە تەنها ( فرمان )ێ زیاتر هیچی تری تێدا نی‌یە •

لە رستەی یەکەمدا (فرمان)[٨٤] بریتی‌یە لە فرمانی یارمەتی دەری (helping Verb) ( ـ • ) کە وەك پاشبەندێک خۆی بەستوە بە ناوەوە ، لە رستەی دووەمدا ، فرمانەکە (سەرکەوت)ە ، وە لە رستەی سێیەمدا ، پاشبەندی یارمەتی دەری ( ـ • ) و بریتی‌یە لە فرمانی یارمەتی دەر وە لە رستەی چوارەمدا فرمانەکە ( هەڵدەسێ )ە ، وە لە رستەی پێنجەمدا ، فرمان ( دانیشتبوین )ە •

لە مەی سەرەوەدا ، ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە هەر رستەیێ ، یەک فرمانی تێدایە ، چونکە رستەکان ساکارن ( واتا ، رستەی ساکار ئەوەیە کە تەنها فرمانێکی تێدابێ ) •

**ب ـ رستەی لێکدراو** **(Compound Sentence)** :

١ ـ | کورد و عارەب یەکیان گرت **و** بوونە برا •
| کورد و عارەب یەکیان گرت **ئەنجا** بوونە برا •
| کورد و عارەب یەکیان گرت **لەپاشا** بوونە برا •
| ئـازاد زیـرەکــــــە ، **بەڵام** هەڵەیە •

٢ ـ | **ئەگەر** هاتیت بۆماڵەوە ، دەم بینی •
| **ئەگەر** بێت بۆ ماڵەوە ، دەم بینی •
| **ئەگەر** دوێنێ بهاتیتایە ، وەزیرت دەدی •
| **ئەگەر** ببینەوە بە منال ، دەگریت بە شوێن دایکتا •

٣ ـ **کەی** ، هاتیت پارەکەت ، دەدەمێ •
**کەی** ، بچیت دەیبینی ••

---

(٨٤) بەلای منەوە ، لە زمانی کوردی‌دا ، رستە نی‌یە بێ (فرمان) بێت ئیتر ، سا بە هەر جۆرێک بێ ، رستە ، دەبێ ( فرمانی تــەواو ) یا ( یارمەتی‌دەر ) ، کە لێرەدا ، جێگەی (verb to be) ی ئینگلیزی دەگرێتەوە هەیبێ ، هەرچێ هەندێ ، لەگەل ئەم رایەدا نین •



منتدى إقرأ الثقافي

٤ ـ | ئەو ئاسکانەی **کەوا** ئەلەوەڕێن ، لە سەختەوە هاتوون ·
| ( صلاح‌الدین ) **کـــە** دونیای گرت ، لە نەوەی کوردە ·

ئەگەر تەماشای ئەو چوار نموونەی سەرەوە بکەین دەبینین کـــە هەریەکە لەو رستانە ( دوو ) فرمانی تێدایـە ؛ لـە رستەی ، ( کـورد و عەرەب یەکیان گرت و بوونەبرا ) دا ، فرمانەکانی ( گرت ) و ( بوون ) هەن · وە لە رستەی ؛ ( ئازاد زیرەکە بەڵام هەڵەیە ) ، دوو فرمانی پاشبەندی یارمەتی دەرمان هەن ، کە ئەوانیش ( ـ ە ) ، ( یە )ە ، کـە بوون بە پاشبەندی وشەکانی ( زیرەکە ) و ( هەڵەیە )[٨٥] لە رستەی ؛ ( ئـەگەر هاتیت بۆ ماڵـەوە ، دەم بینی ) دا فرمانـەکانی ( هـاتیت ) و ( دە ـ بینی ) هەن ، وە لە رستەی ؛ ( ئەو ئاسکانەی کەوا ئەلەوەڕێن لە سەختەوە هاتون ) دا ، فرمانی ( ئەلەوەڕێن ) و ( هاتون ) هەن ·

ئەگە ر چاوێکی تر بخشێنین بە رستەکاندا ، دەزانین کـە هـۆی چی‌یە ؛ دوو فرمان کۆ بونەتەوە لە هەر رستەیەکدا ، وە لام وایە ، ئەو هۆیانەش ئەمانەن :

---

(٨٥) بۆیە ، لە وشەی ( هەڵە )دا ، فرمـانـە پاشبەندە یارمەتیدەرەکـــە نووسراوە بە ( یـ )وە ، چونکە وشـــەی ( هـەڵـە ) ، دوایی بـە ( بزوێن ) هاتوە ، وە لام وایە ، هەر جۆرە ناوێک ، یا ئاوەڵناوێك ئەگەر دوایی بـە بزوێن هـاتبێ ، لـە کاتـی وەرگرتنی فـرمـانی یـارمەتیدەری ( پاشبەند )ی ( ـ ە ) ، ( ـ یـە ) وەر دەگـرێ ، بەڵام لە جۆرەکانی تردا وانی‌یە ، وەك ·

| ئازاد زیرەکە ، بەڵام هەڵەیە ·
| ئەوان زیرەکن ، بەڵام هەڵەن ·
| ئێوە زیرەکن ، بەڵام هەڵەن ·
| من زیرەکم ، بەڵام هەڵەم ·



منتدى إقرأ الثقافي

١ ــ ئامرازی ( و ) و ( ئەنجا ) و ( لەپاشا ) و ( بەڵام )[٨٦] لە نموونەکانی بەشی یەکەمدا کۆ بوونەتەوە ، وە ئەم جۆرە ( ئامرازانەی سەرەوە ) ، ئەگەر هەر یەکێکیان کەوتە ناو رستەوە ، بە دوو ( فرمان ) نەبێ کومـایی نایەت ، وە بە تەواوی وەك وشەکانی (and) , (then) ی ئینگلیزی وان لە ( ئەرك )و ( واتا )دا •

٢ ــ ئامرازی ( ئەگەر ) ، لە رستەکانی بەشی دووەمدا کۆ بوەتەوە و بە هەمان دەستوور دوو فرمانی خواستوە ، وە لە ( ئەرك ) و ( واتا )دا وەك وشەی ( if ) ی ئینگلیزی وایە •

٣ ــ ئامرازی ( کەی ) ، لە رستەکانی بەشی سێیەم دایە وە دوو فرمانیشی خواستوە لە هەر رستەیەکدا ، ئەگەر ، وەك لێرەدا ، بۆ پرسیار بەکار نەهاتبێ • ئەمیش ، وەك ( when ) ی ئینگلیزی وایە لە ئەرك ، و واتادا •

٤ ــ ئامرازەکانی ( کەوا ) و ( کە ) ، لە رستەکانی بەشی چوارەمدا کۆ بوونەتەوە ، وە بە تەواوی وەك وشەکانی (who) , (which) , (that) ی ئینگلیزی وان •

---

(٨٦) ئەم وشەی ( بەڵام )ە ، بە لای منەوە وەك وشەکانی (although) , (though) ی ئینگلیزی وایە ، لە هەندێ رستەدا ؛ وە وە وەك ( but ) وایە لە هەندێکیتردا بۆ نموونە :

He is poor, but he is quiet happy.

Although he is poor he is quiet happy.

واتاکەیان : ئەو هەژارە ، بەڵام زۆر کامەرانە •

هەرچی ئەو هەژارە ، بەڵام زۆر کامەرانە •

یاخود : لەگەڵ هەژاریدا زۆر کامەرانە •



منتدى إقرأ الثقافي

## کەرەستەی رستە

وشەی کوردی ، بە پێی ئەوەی کە کۆ دەبنەوە بە شێوەیەکی وا ، رستەیان لێوە دەرچێت ، دەکرێن بەم جۆرانەی لای خوارەوە :

١ ـ ( ناو ) : ( اسم ) = (Nouns)

٢ ـ ( فرمان ) = ( فعل ) = (Verbs)

٣ ـ ( ئاوەڵناو ) = ( صفه ) = (Adjectives)

٤ ـ ( ظرف ) = = (Adverbs)

٥ ـ وشە کرداری یەکان (Functional-words)

ئەم جۆرەی پێنجەمیان ، جگە لەو چوارەی سەرەوە هەموو جۆرە وشەیەکی تر دەگرێتەوە ، وەک :

ئامرازەکان ، بە هەموو جۆرێکەوە ، و راناوەکان .....[٨٧]

**( نـاو ) Noun :**

ناو چی یە ؟ بە لای منەوە ، ناو ، یا وشـەیەکە یاخود زیاترە لـە وشەیەک ، هیچ کاتی تێدا نی یە و سـەر بەخۆو مانا دارە ، وەک ئـەم نموونانەی خوارەوە :

١ ـ کامەران ، دێ ، بانی خێلان ، سەرسەنگ .

٢ ـ مناڵ ، کچان ، گەل ، کرێکاران .

٣ رووبار ، دارگوێز ، شێر ، خوێ .

٤ ـ برسیەتی ، ئازایەتی ، هێز ، ترس .

**جۆری ناو لە رووی قەوارەوە ( رواڵەتەوە ) :**

لام وایە ، ناو لە رووی قەوارەوە دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

---

(٨٧) لە بەر ئەوی کە باسی ( راناو ) باسێکی دوور و درێژە من لێرەدا لێی لا ئەدەم ( بۆ وەختێکی کە .



منتدى إقرأ الثقافي

**ا ـ ناوی ساکار (Simple-Noun) :**

ناوی ساکار ئەو ناوەیە ، کە تەنها وشەیەکەو بەس ، واتا تاکە وشەیەکە کە واتای ناوی هەیە ، وەك :

شێر ، دەفتەر ، منالّ ، گەل •

**ب ـ ناوی لێکدراو (Compound-Noun) :**

ناوی لێکدراو ئەو ناوەیە ، کە پێك هاتوە لە ناوێك کە بەسەرە دەژمێررێت وە ناوێك یاخود وشەیەکیتر ، وە وەختی واش هەیە پتر لە وشەیەك ، کەکۆ بوونەتەوە و بوونەتە پاشبەندی ناوە سەرەکە(٨٨) ، بۆ مەبەستی ناوێکی نوێی جیاواز لە واتای وشە پێشووەکان وەك :

١ ـ ( گوڵە بە رۆژە ) :

کە بریتییە ، لە : ( گوڵ ـ ە ـ بە ـ رۆژ ـ ە )

٢ ـ ( کانی مانگا ) :

کە بریتییە ، لە : ( کانی ـ مانگا ) ، یاخود ( کانی ـ مان ـ گا )

---

(٨٨) لە دروست کردنی ناوی لێکدراودا ، مەرج نییە دوو ناو بکرێنە یەك یاخود بدرێنە دەم یەك و ناوی لێکدراوی لێ دەرچی ، نا ، بەڵکو بە رێکەوت وا رێکەوتوە کە :

١ ـ کە ( ناو + ناو ) ، وەك ئەوەی یەکەم •

٢ ـ یا ، ( ناو + فرمان ) ، وەك ئەوەی چوارەم •

٣ ـ یا ، ( ئاوەڵناو + ناو ) ، وەك ئەوەی پێنجەم •

٤ ـ یا ، ( ژمارە + ناو ) ، وەك : ( شەصت پەڕ ) •

٥ ـ یا ، ( ناو + چی ) ، کە ( چی ) واتای ( مهنە ) مان دەداتێ ، وەك ، ( قاوەچی ) ، ( چایچی ) •

٦ ـ یا ، ( ناو + وان ) ، کە ئەم ( وان )ە ، واتای نۆسایی دەدا ، لە شتێکدا ، وەك :

( مەلەوان ) ، ( کەژەوان ) ، ( شاخەوان ) و ( ئاشەوان ) ( ئەم زانینە ) زیاتر ئیشی بزوتنی ( لەشی ) تێدایە تا ( فیکری ) •• هتد•



منتدى إقرأ الثقافي

٣ ـ ( چوارتا ) :

که بریتی یه له : ( چوار ـ تا ) ، یاخود ( چوار ـ تاق )

٤ ـ ( کۆپاندروو ) :

که بریتی‌یه له : ( کۆپان ـ دورروو )

٥ ـ ( شینه شاهۆ ) :

که بریتی‌یه له : ( شین ـ ه ـ شاهۆ )

ئەم باسەمان ، له باسی وشه سازی ( morphology ) دا به دوور و درێژی کرد .

**جۆری ناو له رووی ناسیاریەوه :**

ناو ، له رووی ناسیاریەوه ، دەکرێ به دوو بەشەوه :

**أ ـ ناوی ناسراو (Proper-Noun)** (٨٩) وەك :

١ ـ **ئازاد** دەچێ بۆ **سەرسەنگ** .(٨٩)

٢ ـ **تانجەرۆ** دەرژێته **سیروانەوه** .

با ، تەماشای رستەی یەکەمیان بکەین ، لاموایه تۆش لەگەڵمایت ، ئەگەر بڵێم ، دوو ناوی ناسراوی تێدایه ، که ئەوانیش ( ئازاد ) و ( سەرسەنگ )ن لێرەدا ، رەنگ هەیه ، که ئەم پرسیاره بێته پێشەوه ، که ئەویش ئەمەیه :

**ناوی ناسراو مانای چی‌یه ؟؟**

ناسراو ، به لای منەوه ، ئەوەیه ، هەر که وترا ( ئازاد ) ، ئێمە ئەزانین که ناوی کوڕێکه ، یا پیاوێکه که له لای گوێ گرو قسه کەرو

---

(٨٩) ناوەکان له رووی جینسەوه ، لام وایه ، سێ جۆرن :

أ ـ ناوی ( نێر ) ، وەك : پیاو ، گا ، شێر

ب ـ ناوی ( مێ ) ، وەك : ژن ، مانگا ، دەڵەشێر

حـ ـ وشکه ناو ( ناوی بێ لایەن ) ، وەك :

( بانی‌شار ) ، ( پیرەمەگرون ) ، ( تانجەرۆ ) .... (هەولێر) ...



منتدى إقرأ الثقافي

زۆر کەسی تریش دیاری و ناسراوە ، وە هەر کە وتمان ( سەرسەنگ ) دەست بەجێ دەزانرێ کە ئەمە ناوی هاوینە هەوارێکی کوردستانە ، کە زۆر ناسراو و دیاری‌یە لای قسە کەرو گوێ گرو زۆر کەسی تریش •

هەروەها ، لە رستەی دووەمدا ، وشە کانی ( تانجەرۆ ) و ( سیروان ) مان هەن ، هەر کە ناویان برا ، دەس بەجێ گوێ گران ، دەزانن کە ( تانجەرۆ ) ناوی ئەو رووبارەیە کە بە دەشتی شارەزووردا تێ دەپەڕێ و دەرژێتە رووباری سیروانەوە •

لەمەی سەرەوە ، بۆمان دەرکەوت ، کەوا ناوی ( ناسراو ) ، ئەو ناوە تایبەتی‌یەیە کە پڕ بە پێستی ناوەکە ، باسی مرۆڤێ ، یا رووبارێ ، یا جێگایەکی دیاری و ناسراوی تێدایە •

ب ـ **ناوی ناسایی** (Common Nouns) ؛ وەك :(٩٠)

١ ـ ئەرکی **لادێ** کەمترە لە شار•

٢ ـ **گەل** دەبێ سەر کەوێ •

٣ ـ **گۆشت** زۆر گران بوە • (٩١)

٤ ـ **گیان** زۆر خۆشەویستە •

ئەگەر لەم چوار رستەیەی سەرەوە ورد ببینەوە دەبینین کە :

لە رستەی ، یەکەمدا دوو وشە ناوی تێدایە ، کە ئەوانیش ( لادێ ) و ( شار )ن ، وە هەردووکیان ناوی گشتین ، وە دەش توانین بیان ژمێرین و بلێین :

---

(٩٠) هەندێ زمان ناس نووسی‌وَیەتی ( ناوی گشتی ) •

(٩١) دەتوانین ئەو جۆرە ناوانە بە کار بهێنین کە لە چاوگی فرمانەوە دروست کراون ، وەك :
( **خواردن** ، لێرە هەرزانە ) •
( **خوێندن** ، چاو دەکاتەوە ) •



منتدى إقرأ الثقافي

( یەك شار ) وە ( دوو شار ) ، سێ ••••• یاخود بڵێین :

شاران : ( ئەو زۆر گەڕاوە بە شاراندا ) •

شارەکان:( شارەکان ئاوەدان کرانەوە ) •

وە بۆ ( لادێ )ش ، هەمان دەستوور •

با بێینە سەر رستەی دووەم ، دەبینین ، کە وشەی ( گەل ) ، ناوێکە مانای کۆمەڵ دەدات ، لە گەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین :

گەلان ؛ ( سەرکەوتن بۆ گەلانە ) •

گەلەکان ؛ ( گەلەکانی ئاشتیخواز ، سەر دەکەون ) •

یا ، ( گەلانی ئاشتیخواز ، سەر دەکەون ) •

با سەرەنجێ بدەینە ، رستەی سێیەم ، دەبینین کە وشەی ( گۆشت ) ناوێکی ( مادی )یە ، وە لە ژماردنیش نایەت ، مەگەر بەهۆی ( معیاری ) ترەوە بیژمێرین ، وەك بڵێین :

یەك کیلۆ گۆشت •

دوو حتە گۆشت •

نیو تەن گۆشت •

قوتوێ گۆشت •

با سەرنجێ بدەینە ناوی ( گیان ) ، لە رستەی چوارەمدا ، دەبینین، کە هەر بە واتادا دیارە کە ( گیان ) ناوە ، ئەگینا ناتوانین بزانین کە چۆنە وە چە رەنگە ، چونکە نە قەبارەی هەیە ، وە نە رەنگی هەیە •

لەم نموونانەی سەرەوە ئەوە.مان بۆ دەر دەکەوێ کە ناوی ئاسایی دوو جۆرن :

١ ــ یەشێکیان دێنە ژمێردنەوە ، لە بەر ئەوە ، بە لای منەوە وا باشترە پێیان بوترێ : ( ناوی ئاسایی لە ژماردن هاتوو ) •



منتدى إقرأ الثقافي

ب ـ یەشێکیان لە ژماردن نایەن ، لە بەر ئەوە وا باشترە ناویان ، « ناوی ئاسایی لە ژماردن نە هاتوو » بێ •

**ناو لە رووی سەر ژمێرییەوە :**

لە رووی سەر ژمێرییەوە ، ناو دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

**أ ـ ناوی ( تاك ) =(Singular) :**

وەك :

١ ـ ئەرێ قەڵەمێ بە چەندە ؟

٢ ـ ئەو کورە چی دەکا لەوێ ؟

٣ ـ ئەمڕۆ یەك مریشکم کڕی •

٤ ـ بوچی ! شووتییەکە ، لەت کراوە ؟

تەماشایەکی ئەو رستانەی سەرەوە ، بۆت دەر دەکەوێ ، کە هەر یەکەیان ( ناوێکی ) تێدایە ، کە ئەوانیش ( قەڵەم ، کوڕ ، مریشك و شووتی )ن ، وە هەر یەکە لەو ناوانە ( تاکە ) واتا لە یەك زیاتر نییە •

**ب ـ ناوی ( کۆ ) : (Plural)**

وەك :

١ ـ کوڕ و کچ پێکەوە دەخوێنن[(٩٢)] •

٢ ـ ئەو منالانە نانیان خواردوە •

٣ ـ ئەمڕۆ ( دە ) قەڵەمم کڕی •

لە رستەی یەکەمدا ، ( کوڕ ) و ( کچ )مان هەن ، هەردووکیان ناون ، وە هەر یەکەیان واتای ( کۆمەڵ ) دەبەخشێت ، کچ ، واتای ( کچ گەل ) وە ( کوڕ ) واتای ( کوڕ گەل ) دەدەن •

---

(٩٢) لێرەدا ( کوڕ ) مانای ( کوڕان ) دەدات وە ( کچ ) ، مانای ( کچان ) دەدات •



منتدى إقرأ الثقافي

هەر وەکو ، لە سەرەوە بۆمان دەرکەوت ، هەندێ ناو هەن ، هەرچی بە قەوارە تاکن ، لەرستەدا ، بەلام دەشێ بە کۆمەڵ بدرێنە قەڵەم .

لە رستەی دووەمدا ( کوڕەکان ) ، کۆی ( کوڕەکە )یە بە هێنانی پاشبەندی ( کۆ ) کردنەوە ، کە ( ـ ان )ە کراوە بە کۆ ( جمع ) .

لە رستەی سێیەمدا ، وشەی ( منالانە )ـان هەیە ، کە ( کۆ )یە ، بۆ ( منال ) ، وە بە هۆی پاشبەندی ( کۆ )وە کە ( ـ ان )ە ، بووە بە ( منالانە ) .

لە رستەی چوارەمدا ، دەبینین کە وشەی ( دە ) کراوە بە ناو و نیشان هەڵدەری و شەی ( قەڵەم ) ، کە ناوێکی تاکە ، وە لێرەدا ، ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ ، کە ئەگەر ویستمان ژمارە بەکار بهێنین لە گەڵ ناودا ، بۆ مەبەستی ( کۆ ) پێویستە ژمارەکە ، بخەینە پێش ناوەکەوە ، وە ناوەکەش بە تاکی بهێڵینەوە ، وەك :

یەك پیاو

دوو ژن

صەد دینار

**ناو ، لە رووی جینسەوە :**

لەرووی جینسەوە ، ناو دەکرێ بە سێ جۆرەوە :

**أ ـ ناوی نێر** (masculine Noun) :

وەك ئەم نموونانەی خوارەوە :

١ ـ پیاو ، کوڕ ، زاوا

٢ ـ
- ئەسپ ، سابرین ، بەران .
- کەو ، گا ، کەر .
- ورچ ، شێر ، سەگ .



منتدى إقرأ الثقافي

ئەم جۆرە ناوانە ، هەر لە مانایاندا دیارە ، کە بۆ (نێر) دانراون؟ هەموو زیندەوەرێک نێرو مێی هەیە بەلاّم ، نێرو مێی هەندێکیان ئاشکرایە ، بە هۆی ناوی تایبەتی بۆ ( نێری)و بۆ ( مێ )ی وە لە هەندێکی تریش‌دا بە پێچەوانەیە ، نازانی ، یاخود ناوی تایبەتی نی‌یە بۆ ( نێر ) و ( مێ )ی •[93]

## ٢ ـ ناوی مێ (Feminine Noun) :

ئەم جۆرە ناوانە ، لە هەندێکیاندا ، دیارە کە بۆ مێ‌یە ، وە لە هەندێکی تریشیاندا ، بە پێشبەندێ دەبنە ناوی مێ ، وەك :

١ ـ ژن ، کچ ، بووك ، ماین ، بزن ، مەڕ ، ئەمانە تایبەتین بۆ (مێ) •

٢ ـ ئەم ناوانەش ، بە هۆی هێنانی پێشبەندی دێڵە ( دەڵە ) ، ( ما ) ، ( مان ) ••• دەبنە ناوی مێ ، وەك :[94]

| | |
|---|---|
| دەڵە : | دەڵە ورچ ( دێڵەورچ ) |
| دێڵە : | دێڵە شێر ( دەڵەشێر ) |
| ما : | ماکەو |
| مان : | مانگا • |

## ٣ ـ وشکەناو (Neuter Noun) :

ئەم جۆرە ناوانە ، نە نێریان هەیە ، وە نە مێ واتا ، ناوی بێ لایەنن ، وەك :

کانی ، دار ، ئاو ، ئاسن ، شاخ •

---

(٩٣) هەر وەك چۆن ، لە هەندێ ناودا پێشبەندێ بەکار دەهێنین بۆ ناوی مێ‌ی ، هەروەها دەتوانین پێشبەندی ( نێر ) بەکار بهێنین بۆ دروست کردنی ناوی ( نێر )ی ئەو ناوانە کە ناوی تایبەتی نێرو مێ‌یان نی‌یە ، وەك : ( نێرەکەو ) •

(٩٤) مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە ڕێزمانی کوردی‌دا کاری هیناون •



منتدى إقرأ الثقافي

بەڵام ، ئەم جۆرە ناوانەش ، لە زاری هەورامیدا ، نێر و مێیان بۆ هەیە ، لە کاتی بە کار هێنانیاندا لە ڕستەدا ، بۆ نموونە •

١ ـ ئاوەکێ وشکە بیٖیە •
٢ ـ دارەکە وشك بی •

ڕستەی یەکەم ، بە سۆرانی واتای :
( ئاوەکە وشك بوو ) دەدات
وە ڕستەی دووەم واتای :
( دارەکە و شك بوو ) دەدات

« لە زاری هەورامیدا پاشبەندی /ێ/مان بەکار هێنا بۆ ( مێ ) ، کە بەستمان بە وشەی ( ئاوەك )ێوە ، وە پاشبەندی ( ـ ە ) بە وشەی ( وشك )ەوە وە ( ـ یە ) بە وشەی ( بی )ەوە • ئەم جۆرە شتانەی زاری هەورامی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی دوورو درێـژی ئـەوێت ، وە ئیشی ڕۆژو دوو ڕۆژیش نیٖیە ، لەبەر ئەوە لێی لا ئەدەم لەگەڵ داوای لێ بوردن کردن • لە ڕستەی دووەمدا ( دارەکە بە ( نێر ) دانراوە لە زاری هەورامیدا لە بەر ئەوە سەرانسەری ڕستەکە جیاوازیهەیە لەگەڵ ئەوەی پێشەوەدا ، تۆ خۆت بەراوردی بکە • »

**چۆن ناوی تاك بەكار دەهێنرێ لە ڕستەدا ؟؟**

بۆ بە کارهێنانی ناوی تاك لە ڕستەدا ، بە هۆی یەکێ لەم ڕێگایانەوە دەبێ : ـ

١ ـ بەکار هێنانی ناوەکە ، خۆی بەتاکی ، وەك :
هەنار : هەنار بەچەندە ؟• (٩٥)

---

(٩٥) ئەم پرسیارە ، بە لای منەوە ، ئەم وەڵامانەی هەیە :
١ ـ هەناری بە بیست فلسە •
٢ ـ یەکی بە بیست فلسە •
٣ ـ دانەی بە بیست فلسە •
٤ ـهەر دەی بە دووصەد فلسە •
٥ ـ کیلۆی بە صەدو بیست فلسە •



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ بەكار هێنانی وشەی یەك ، لە پێش ناوەكەوە بۆ مەبەستی زانین لە ڕووی ژماردنەوە ، واتا دەبێتە هەڤاڵناو ( ئاوەڵناو ) بۆ ناوەكـە ، وەك :

یەك ( هەنار ) م بدەرێ .

یەك ( هەنار ) ی بدەرێ .

٣ ـ بەكار هێنانی پاشبەندی ( ـ ێك ) بە دوای ناوەوە ، وەك :

( هەنارێك ) م ، بدەرێ .

یاخود ، لەگەڵ ، بەكارهێنانی پاشبەندی ( ـ ێك )دا ، دەش توانی وشەی ( تاكە ) لە پێش ناوەكەوە بەكار بهێنیت ، وەك :

تاكە ( هەنارێك )م ، بدەرێ .

٤ ـ بەكـار هێنـانی وشـەی ( تاكـە ) لەگەڵ ( دەنكێك )[٩٦] بە بێ ئەوەی ناوی ناوەكە بهێنی ، بە مەرجێ ئیشارەتێكی دەسی یا هـەر جۆرە ئیشارەتێكی تر ، كە بتوانێ ئـەو پێویستە ، دیـاری بكـات ، واتـا ( دەنكێك ) وەك جێی ناوەكەی گرتبێ وایە ، لە بەر ئەوە وشەی ( دەنكێك ) بە جێگاداری تاكە ناوێ دەدرێتە قەڵەم ، وەك :

تاكە ( دەنكێك ) م ، بدەرێ .

٥ ـ بەكار هێنانی ئامرازی پیشاندان ( الأشارە ) ، وەك ( ئەم ) ، ( ئەو ) بۆ ئەوەی ، بتوانرێ ناوی تاكی پاشبەندداری لە گەڵ دا بەكار بهێنرێ ، وەك

ئەو ( هەنار )ە بە چەندە ؟

ئەم ( هەنار )ە بە چەندە ؟

---

(٩٦) وشەی ( دەنك ) ، بۆ واتای تـر ، بـەكـار دەهێنری ، وەك واتای ( خۆشەویست ) بێ ، یا خود ( دەسگیران ) وەك دەڵێن :
بەخوا دەنكێكی جوانی هەیە .
یاخود : دەنكەكەت چۆنە ؟



منتدى إقرأ الثقافي

٦ ـ بەکار هێنانی ئامرازی ناسینی وەك ( ـ ە کە ) ، کە دەبێتە پاشبەندی ناوەکە و دیاری دەکات ، کە تاکە ، وەك :[٩٧] .

لە کوێ ( هەنارەکە )ت ، دانا ؟

لە کوێ ( هەنارەکە )ی ، دانا ؟

من ( هەنارەکە )م ، لەت کرد .

---

(٩٧) پاشبەندی ناسین ، بۆ تاك ، ( ـ ەکە )یـە ، وە هی ( کـۆ ) ( ـ ەکان )ە .



منتدى إقرأ الثقافي

# ناوی داتاشراو ( یاخود دروستکراو )

بۆ دروست کردنی ناو ، چەند ڕێگایەك هەن ، کە وەکو هێنانی ( پێشبەندو پاشبەند ) بۆ ( ناو و کردار و ڕەگی فرمان ، و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار ) ، بۆ ئەوەی ببنە ( ناو ) • ، لام وایە شتێك لەم ڕووەوە ، لەبەشی ( وشەسازی )دا پیشان درا ، بەڵام هەر بەشێکی لە جێگایەك دا ، وا لێرەدا تەقالا ئەدەین بۆ ئەوەی هەندێ لەوانە ، لێرەدا کۆ بکەینەوە •

**١ ـ دروست کردنی ناو لە ( ئاوەڵناو ) :**

بۆ دروست کردنی ( ناو ) لە ( ئاوەڵناو ) ( پێویست بە بەکار هێنانی ئەم پاشبەندانە دەکات :

| پاشبەند | ئاوەڵناو | نـاو |
|---|---|---|
| ( ـ یی ) | ئازا | ئازایی (٩٨) |
| ( ـ یەتی ) | ئازا | ئازایەتی (٩٩) |
| ( ـ ی ) | ڕەش | ڕشـی (١٠٠) |
| | | ڕەشیەتی (١٠١) |
| ( ـ ایی ) | سپی | سپیایی (١٠٢) |
| | | سپیەتی (١٠٣) |
| ( ـ ە ) | چاك | چاکە (١٠٤) (١٠٥) |

(٩٨) ئەوە ( ئازایی ) نییە • ( ئازایی ) لێرەدا ، جێگای ( ئاوەڵناو ) و ( ناوی ) شـی گرتوە ، دەتوانین بـە ( ناو ) یا بـە ( ئاوەڵنـاو ) بیدەینە قەڵەم •

(٩٩) بە ( ئازایەتی ) سەرکەوت • ( ئازایەتی ) سەرمان دەخات •

(١٠٠) ( ڕەشی ) کەوتوەتە خواردنەکەوە •

(١٠١) ( ڕەشیەتی ) مەنجەڵەکە پاك کرایەوە •

(١٠٢) ( سپیسایی ) بۆ تەندروستی باشە• (سپیایی = ماست دۆ••)

(١٠٣) ( سپیەتی = سپێنە ) •

( سپیەتی ) هێلکەکە خۆشترە تا ، زەردێنەکەی •

یاخود ( سپێنەی ) هێلکەکە خۆشترە تا ، زەردێنەکەی •

(١٠٤) ( چاکەی ) زۆر هەیە بە سەرمەوە •

(١٠٥) جۆری تر زۆرە ، وەك : ( مزر ) ( مزرۆکە ) ( ڕەش ) ؛ ( ڕەشۆك ) ؛ ( ترس ) ؛ ( ترسنۆك )



منتدى إقرأ الثقافي

**٢ ـ ا ـ دروست کردنی ( ناو ) له ( فرمان ) :**

ئەم جۆرە ناوە دروستکراوانە ، هەموو جۆرە چاووگێ دەگرێتەوە ، وە بۆ هێنانەوەی چەند نموونەیەك ، وای بە باش دەزانم کە فرمانی رابوردووی نەفەری سێیەمی تاك بکەم بە کێش ٠

| فرمان | چاووگ [١٠٦] |
| --- | --- |
| پێچای | پێچان [١٠٧] |
| سووتاندی | سووتاندن [١٠٨] |
| گرتی | گرتن |
| خەوت | خەوتن |
| خواردی | خواردن |
| چاندی | چاندن |
| زانی | زانین |
| نووسی | نووسین |
| چوو | چوون |
| بوو | بوون |

(١٠٦) ( مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ ، بەم جۆرە ناو و نیشانی هەڵداوە چاووگ : بە وتەیەك ئەڵێن کە کردەوەیەك بگەیەنێ بە بێ کات وبکەر وە لە دواییە کە شییەوە « ن » ببێ ، وە ناویشی ناون بە : « ئەلفی و تائی و دالی و واوی و یائی ٠ » فەرهەنگی خاڵ ج١ ) ٠ منیش ئەڵێم ، پێویستە ئەرکی ناویش بەرێ بەرێوە

(١٠٧) من بۆیە ئەڵێم ناوە ، چونکە جێگای ( ناو ) ئەگرێتەوە و کرداری ( ناو ) ئەکات ، لە ناو رستەدا ، وەك :

| ئەو برینە ( پێچان )ی دەوێت ٠ |
| ئەو کورە ( نان )ی دەوێت ٠ |

(١٠٨) چاووگی لێکدراویش دەگرێتەوە ، وەك :
هەڵسان ، هەڵماڵین ، پێ‌لێ‌هەڵبرین ٠٠٠٠



منتدى إقرأ الثقافي

**ب ـ ( ناو ) له ڕه‌گی فرمان :**

ئه‌م جۆره ناوانه دروست ده‌بن به هۆی هه‌ندێ پاشبه‌نده‌وه ، که ده‌خرێته پاشکۆی ڕه‌گی فرمان ، وه‌ك :

| ڕه‌گی فرمان (١٠٩) | نـاو | پاشبه‌ند |
|---|---|---|
| چێژ (چه‌ش) | چێژه (چه‌شته) | ( ـ ه ) (١١٠) |
| وه‌ڕ | وه‌ڕه | " (١١١) |
| ژمێر | ژمێره | " |
| پژم | پژمه | " |
| گرم | گرمه | " |
| کۆك | کۆکه | " |

**٣ ـ أ ـ له هه‌ندێ** ( ناو ) ، ناوی تر دروست ده‌کرێ ، ئه‌ویش به هۆی هه‌ندێ پاشبه‌نده‌وه ، که ده‌خرێته پاشکۆی ئه‌و ناوانه ؛ ئه‌م جۆره پاشبه‌ندانه‌ش ده‌بنه هۆی نزم کردنه‌وه‌ی نرخ و پله‌یان ٠

| نـاو | ناوی دروستکراو | پشبه‌ند |
|---|---|---|
| شێر | شێرۆ | ( ـ ۆ ) (١١٢) |
| که‌ڕ | که‌ڕۆکه | ( ـ ۆکه ) (١١٣) |
| ته‌پ | ته‌پۆلکه | ( ـ ۆلکه ) (١١٤) |
| مه‌مك | مه‌مکۆله | ( ـ ۆله ) |

(١٠٩) بۆ دۆزینه‌وه‌ی ڕه‌گی فرمـان ، من به‌لامه‌وه ، ڕێگاکـه‌ی کـاك ( ئه‌وره‌حمان ره‌شید ) که له ( ژین )ی (١٢٢)دا نووسیبووی زۆر باشه ، ئه‌ویش ، هه‌ر وه‌ك کاکی ناوبراو وتویه‌تی دروست کردنی کرداری داخوازی و لابردنی نیشانه‌ی داخوازی‌یه که ، له گه‌ل ڕاناوه که‌سیه‌که‌دا ، ته‌نها ( ڕه‌گه )که ده‌مێنێته‌وه ٠

(١١٠) چێژه ( چه‌شته ) بۆ چۆله‌که‌کان دابنێن ٠

(١١١) ( وه‌ڕه )ی سه‌گه‌که با خه‌به‌ری کردمه‌وه ٠

(١١٢) شیرۆ ، وه‌ڕی ٠

(١١٣) ( که‌ڕۆکه ) ، بچووکتره له ( که‌ڕ ) ٠

(١١٤) زوربه‌ی ئه‌م‌جۆره ناوانه ، له باسی وشه سازی‌دا له به‌شی ناوی لێکدراودا هه‌ن ٠



منتدى إقرأ الثقافي

| | | |
|---|---|---|
| تیر | تیرۆك | ( ـ ۆك ) |
| دەست | دەستەك | ( ـ ە ك ) |
| ئاسك | ئاسكۆڵ | ( ـ ۆ ڵ ) |
| گۆزە | گۆزەڵە | ( ـ ڵە ) |
| كار | كاریلە | ( ـ یلە ) |
| مێش | مێشوولە | ( ـ وولە ) |
| باخ | باخچە | ( ـ چە ) |
| نیو ( نیم ) | نیوچە (نیمچە) | ( ـ مچە ) |

ب ـ **بە ( كۆ ) كردنەوەی** ناوی ( تاك ) ناوی ترمان دەستگیر دەبێ ، وەك :

| **ناوی تاك** | **ناوی كۆ** | **پاشبەندی ( كۆ )** |
|---|---|---|
| كوڕ | كوڕان | ( ـ ا ن )(١١٥) |
| كچ | كچان | ( ـ ا ن ) |
| گا | گاگەل | ( ـ گەل ) |
| شارەزا | شارەزایان | ( ـ یان ) |
| باغ | باغات | ( ـ ات ) |
| میوە | میوەهات | ( ـ هات ) |

ح ـ **ناوی لێكدراو** كە لە بتر لـەوشـەیـەك دروسـت دەبێ ، ئـەم باســەمان لە پێشەوە باس كرد ، تەماشای بكە ٠

٥ ـ **دروست كردنی ( ناو ) لە ئاوەڵكردار :**

ئەم جۆرە ناوانە دروست دەكرێن بە هۆی هەندێ پاشبەندەوە كـە

---

(١١٥) لە هەورامیدا ، ئامرازی ( كۆ ) جیاوازە ؛ ( ـ ێ ) بـۆ زوربە بەكار دەهێنرێت ، واتا دەبێتە پاشبەندی ناو ، بەڵام ئەم /ێ/یە ، نـە /ی/ یـە وە نـە /ێ/ی زاری سـۆرانییە ، وا لـە میانـەی هەردووكیاندا ، وەك :

| | |
|---|---|
| كوڕ ؛ كوڕێ ٠ | زارۆڵە ( مناڵ ) ٠ |
| كناچێ ( كچ ) ؛ كناچێ ٠ | زارۆڵێ ( مناڵان ) ٠ |



منتدى إقرأ الثقافي

دەخرێنە پاشکۆی هەندێ ئاوەڵکردارەوە ، وەک :

| **ئاوەڵکردار** | **ناوی دروستکراو** | **پاشبەند** |
| --- | --- | --- |
| ژێر | ژێر پیاڵە | ( ـ پیاڵە ) |
| سەر | سەربان | ( ـ بان ) |
| لا | لاپاڵ | ( ـ پاڵ ) |

## فرمان ( کردار )

فرمان ، لە رووی کار کردنەوە ( ئیش بردن بە ریوە ) دەکرێن بە دوو جۆرەوە :

**١ ـ فرمانی یارمەتیدەر (Helping-Verb) :**

ئەم فرمانانە ، جۆرە پاشبەندێکن ، کە دەبنە پاشبەندی ( ناو ) یاخود ( ئاوەڵناو ) ، لە رستەدا ، وە شێوەی قەوارەی بە ستراوە ، بە شێوەی قەوارەیانەوە ، واتا ئەگەر ( تاك )بن ئەوە تاکە ، وە ئەگەر ( کۆ ) بن ، ( کۆ )یە ٠

هەرچی بە رواڵەت لە فرمان ناکەن ، بەلاّم لە ناوەرۆکەوە کردارین ، چونکە واتای ئیش دەبەخشن ، کە ئەویش وەک بلّێیت : ( هەیە ، یاخود ئێستا وایە ) ، وایە ، ئەمانەش ئەمانەن :

**ا ـ ئەوانەی کە دەبنە پاشبەندی ( ناو ) ، وەک :** (١١٦)

پەروین کچە ٠

پەروین ( کچ )ە ٠

---

(١١٦) وەختێ ئیشی ئەم جۆرە فرمانانە دەر دەکەون کە ببنە پاشبەندی ( ناوێ ) یا ( ئاوەڵناوێ )کی وەختی ، وە بەراورد بکرێن لە میانەی رابوردو و ئێستاو داهاتووی دا ، وەك :

ئازاد منالّ بوو ٠ ( لەوە وپێش ) ٠

ئازاد لاوە ٠ ( ئێستا گەنجە یاخود لاوە ) ٠

ئازاد پیر دەبێ ٠ ( لە پاشە رۆژدا ) ٠



منتدى إقرأ الثقافي

ئەوە ( کچە ) •

پەروین و نەسرین کچن ••
ئەوان     ( کچ )ن ••

ئەم پاشبەندانە ( ـ ە ) و ( ـ ن ) وەک فرمانی یارمەتیدەری ئینگلیزی وان ، (١١٧) واتا (Verb to be) وە قەوارەیان بەستراوە بە قەوارەی ناوەکەوە ، ئەمانەش نموونەی ئینگلیزین :

Perween is a girl.
She is a girl.
They are girls.

**ب ـ ئەوانەی کە دەبنە پاشبەندی ( ناوە لناو ) ، وەک :**

پەروین     کامەرانە •
ئـەو     ( کامەران )ە •
ئەوان     ( کامەران )ن •
تۆ     ( کامەران )ی •
ئیمە     ( کامەران )ین •

**ح ـ فرمانی یارمەتیدەر** ( دەست ـ پیٚ کرد ) ، وەک :

سینەما دەستی پی کرد •
یاری دەست پیٚ دەکات •

**د ـ فرمانی یارمەتیدەر** ( دەست ـ بە ـ کرد ) ، وەک :(١١٨)

پەروین دەستی بە خوێندن کرد •
سینەما دەست بە ئیش کردن دەکات •

---

(١١٧) مامۆستا مەسعود محەمەد لووتە لایە لە وانەی کە ئەمانە بە ( فرمان ) دادەنێن ( ورد بوونەوە لە چەند باسێکی ریزمانی کوردی ) •

(١١٨) ئەم فرمانی یارمەتیدەرە لە لایەن مامۆستا دوکتور عیزەدین مستەفاوە باس کراوە ـ گۆڤاری بەیان ژمارە (٤) •



منتدى إقرأ الثقافي

هـ ـ فرمانی یارمەتیدەر ( هە ـ ) ، وەك : (۱۱۹)

| | |
|---|---|
| من | هەمە • |
| تۆ | هەتە • |
| ئێمە | هەمانە • |
| ئەوان | هەیانە |
| ئێوە | هەتانە • |

| | |
|---|---|
| من | بووم • |
| من | دەمبێ • |
| تۆ | بووت • |
| تۆ | دەتبێ • |
| ئێمە | بوومان • |
| ئێمە | دەمانبێ • |
| ئێوە | بووتان • |
| ئێوە | دەتانبێ • |
| ئەوان | بوویان • |
| ئەوان | دەیانبێ • |

ئەگەر سەرنجێ بدەینە ئەم فرمانانەی سەرەوە ، دەبینین کە زۆر سستن واتا جموجۆڵیان نییە ، نە بە ( کردار ) وە نە بە ( بیر ) ، جا هەر لەبەر ئەوە ، وە لەبەر ئەوەیش کە نیشانەی (Possessive) یاخود ( تملك ) یان تیدا هەیە ، بە فرمانی ( یارمەتیدەر ) سەر ژمێرمان کردن •

۲ ـ فرمانی بزێو :

بەلای منەوە ، ئەم جۆرە فرمانانە بە شدارن لە دووشتدا ، ئیشی فیکری وە ماسولکەیی بەلام زۆر نەبێ کەم ، دەتوانین بیانکەین بە دوو

(۱۱۹) گومانی تیدا نیە کە رستە دبێ فرمانی تێدابێ ، هەر چەندە ئەم ( رایە ) بە توندی لە لایەن مامۆستا مەسعود محەمەدەوە ، رەفز کراوە ـ تەماشای کتێبەکەی کە ( ورد بوونەوە لە چەند باسێکی رێزمانی کوردی ) چابخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ۱۹۷٤ •



منتدى إقرأ الثقافي

جۆرەوە :

١ ـ **ئەو فرمانانەی** کە پێویستی‌یان بە ئیشی ماسۆلکەیی هەیە ، وەک : هەڵسان ، هەناسەدان ( هەڵدەسێ ، هەڵسابوو ، هەڵدەسم ، هەڵدەسن ٠٠٠٠ )

٢ ـ **ئەو فرمانانەی** کە پێویستی‌یان بە ئیشی فیکری هەیە ، وەک ( خوێندن ) ، دەڵێین : ( دەخوێنم ، خوێندم ٠٠٠ ، ٠٠٠٠ ) ٠ خوێندن بە واتای ( سەعی و دەوز کردنەوە ) ٠

تەماشای ئەم هۆنراوەی شێخ سەلام : (١٢٠)

هەستە لە خەو ئەی لاوی کورد
تێ بکۆشە بە دەست و برد
هاوار ئەکا دایکی وەتەن
واگیان ئەدا پایا بگەن

★ ★ ★

مردن ، رزین ، بوون بەم خاکە
وەتەن باوک وەتەن کاکە

**دەمەکانی فرمان :**

**( سەلام )**

**فرمان ، لە رووی دەمەکانەوە دوو جۆرن ؛**

**یەکەم : فرمانی رانەبوردوو ؛** کە بریتین لە :

**أ ـ داخوازی** ، وەک :

بە یارمەتیت : **بێ دەنگ بە** ٠ (١٢١)

---

(١٢٠) تەماشایەکی ئەم فرمانانە بکە و بزانە چ سەردەمێك دەردەخەن ( هەستە ، تێبکۆشە ، ئەکا ، بگەن ، مردن ، رزین ، بوون٠٠)٠

(١٢١) بۆ زیاتر رۆشن کردنەوە ، تەماشای ئەم نموونانە :

أ ـ بە یارمەتیت ، هەڵیگرە ٠ (داخوازی)

ب ـ هەڵیگرە ٠ ( فەرمان )

حـ ـ هەڵیدەگرێ ٠ ( دادێ )



منتدى إقرأ الثقافي

ب ـ **فەرمان** : بێ دەنگ **بە** ٠

ح ـ **دادێ** : بێدەنگ **دەبم**

**دووەم ، رابوردوو** ؛ کە ئەوانیش بریتین لە :

أ ـ **رابوردووی** تەواو : بیدەنگ **بووم** ٠

ب ـ **رابوردووی** نارەبەق : بێدەنگ **بووتایە ( بوویتایە )** ٠

**جۆری فرمان لە رووی قەوارەوە :**

فرمان ، لە رووی قەوارەوە دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

**١ ـ فرمانی ساکار :**

فرمانی ساکار ، لام وایە ، ئەو فرمانەیە کە تەنها لـە تاقە رەگێکی فرمانێ دروست کراوە ، ( واتا تاقە وشەیەک ) وەك :

پەروین **نووست** ٠

ئەو نان **دەخوا** ٠

**٢ ـ فرمانی لێکدراو :**

فرمانی لێکدراو ئەوەیە ، کە لـە زیاتر لـە وشەیەك پێک هاتبێ ، وەک :

ئەرمین **هەلدەسێ**

دلشاد **سەردەکەوێ** ٠

وشەکانی ( هەڵدەسێ ) وە ( سەر دەکەوێ ) بریتین لە : ( هەڵ ـ دە ـ س ـ ێ ) وە ( سەر ـ دە ـ کەو ـ ێ ) ٠

**چۆن فرمانی لێکدراو دەناسین ؟**

بۆ ئەوەی فرمانی لێکراو لە سادە جیا بکەینەوە ، فرمانی داخوازی ، یا دادێ لە ( چاووگ ) دروست دەکەین ، ئەگەر ئامرازی ( داخوازی ) یاخود ( دادێ ) کەوتە ناوەوەی فرمانەکەوە ، ئەوە ، فرمانی لێکدراوە ، ئەگینا ، ناء ٠

وەک :



منتدى إقرأ الثقافي

سەرکەوتن : سەربکەوە

سەردەکەوێ •

لێرەدا ئامرازی داخوازی ( ـ بـ ـ )یە ، وەهی دادێ ( ـ دە ـ )یە ئەم ئامرازانە ، دەبنە ناوبەند و دەچنە ناوەوەی ( واتا دەبنە نـاواخن ) فرمانە لێکدراوەکەوە •

لـە زمـانی کوردیدا ، فرمانی لێکدراو ( زۆر زۆرن ) وا لێرەدا هەندێکیان پیشان دەدین : (١٢٢)

| | |
|---|---|
| سەردەکەوێ • | هەڵدەقوڵێ |
| سەردەردەهێنێ • | هەڵدەدوشێنێ • |
| سەردەبڕێ • | هەڵدەچێ • |
| خلدەبێتەوە • | دادەمرکێ • |
| گلدەبێتەوە • | دادەنیشێ • |
| تێوەدەژەنێ • | دادەنیشێ • |
| تێوەدەگلێ • | دادەچرکێ • |
| تێوەدەسرەوێنێ | دادەچڵەکێ • |
| پێوەدەبێ • | رادەکا • |
| پێوەدەتلێ • | رادەوەستێ • |
| لێدەخوڕێ • | رادەکشێ • |
| لێدەپرسێ • | رادەسپارێ • |
| لێدەژەنێ • | رادەبەڕێ • |
| هەڵدەسێ • | |

---

(١٢٢) بۆ زیاتر زانینی فرمـانی لێکدراو ، کتێبەکـەی د٠ن فـەخـری بخـوێنـەرەوە ( چـاوکی بێ واتا ) ٠ ئێمـە زۆربـەی ئەوانەمان لە هەمان سەرچاوەوە وەرگرتوە لەبەر ئەوە ، قەرزارینی ٠



منتدى إقرأ الثقافي

**فرمانی رانه بوردوو :**

فرمانی رانه بوردوو ، له زمانی کوردی‌دا ، بۆ چەند مەبەستێ بەکار دەهێنرێت ، وەک :

١ ـ بە واتای ئیش کردنێکی سەرەمرەیی ؟

ئازاد ئاسنی سارد **دەکوتێ** .

ئەو ، نوێژ **دەکات** .

ئاوم ..... ئاوم

ئاوی تینووم

سەرچاوەکەم ... لە دەمی شەوێکی سوێردا

**هەل ئەقولێ** ( شێرکۆ بێ کەس )

٢ ـ بە واتای خوو .

ئەو جگەرە **دەکێشێ** .

هەر نان و چا **دەخوات** .

٣ ـ بە وتای راستی گەیاندن ؟

مزگەوت بێ مەلا **نابێ** .

چەم بێ چەقەڵ **نابێ** .

٤ ـ بە واتای دوا رۆژ ؟

دەر دەچم .

چیت دەوێ دەتدەمێ .

٥ ـ بە واتای راگەیاندن ؟

ئەو لە خشەی مار دەترسێ .

هەر خۆم زەویەکە دەکێڵم .

٦ ـ بە واتای پێویستی ؟

بترسم لە درۆزن باشە .

پارێز بکەم باشە .



منتدى إقرأ الثقافي

٧ ـ بە واتای ئامۆژگاری :

بترسە لە دوو روو •

بمرە بۆ ژیان مەمرە بۆمردن •

٨ ـ بە واتای فەرمان :

شتی رەق بە دان مەشکێنە ( ئامۆژگاری ـ فەرمان )
زوو هەڵسە لە خەو •

٩ ـ بە واتای ئاوات خواستن :

خوزگە ! دەهات بۆ ئێرە •

بریا ! دەهات بۆ ئێرە •

صەدبریا ! دەهات بۆ ئێرە •

کاشکی ! دەهات بۆ ئێرە •

ئاخ ! دەهات بۆ ئێرە •

وەشڵەی ! ئامێ پەی ئێگەی • ( بە زاری هەورامی ) •

١٠ـ بە واتای روخسەت دان ، ئەگەر ئامرازی ( با )ی لەگەڵ دا بەکار هێنرا ، وەک :

با بڕوات ، بۆ ئەوێ •

یاخود بریار دان بە دەست پێ کردنی ئیشێک ، وەک :

( با ) بڕۆین بۆ هەولێر •

( دەبا ) بڕۆین بۆ سینەما •

١١ـ بە واتای فەرمان ، لەگەڵ ( ئەبێ ) ویا ( دەبێ )دا •
وەک :

( ئەبێ ) ئەرکەکەت بکەیت ئەنجا بڕۆیت •

یاخود بە واتای ( رەنگ بێ ) ، وەک :

( ئەبێ ) بڕوات ! ، واتا : رەنگ بێ بڕوات •



منتدى إقرأ الثقافي

**فرمان له رووی هێزەوە :**

له رووی هێز داری و بێ هێزی‌یەوە ، فرمان دوو جۆرن :

١ ـ **فرمانی تێپەڕ** ، ئەو فرمانەیە ، کـه جگـه له فرمانکەر ( فاعل ) • پێویستیشی به فرمانبەریش ( مفعول به ) هەیه وەك :

مەی کراسێکی **کڕی** •

شیروان ، دەرگاکەی بۆیە **کرد** •

٢ ـ **فرمانی تێنەپەڕ** ؛ ئەو فرمانه بێ هێزەیه که پێویستی‌به (فرمانبەر ـ مفعول به ) نی‌یه ، وەك :

نەرمین **نووست** •

لێرەدا ، فرمانی ( نووست ) به ( بێ هێز ) بەکار هێنراوه دەش توانین بـه ( هێزدار ) بەکـاری بهێنین ، وەك نـەرمین ئـازادی نواندا(١٢٣) •

**ئـاوەڵنـاو :**

ئاوەڵناو شتێکه ، که تاریفی ناو یا راناو دەکات ، وه بۆی هـەیـه که :(١٢٤)

١ ـ یەك وشه بێت ، وەك :

نەرمین **زیرەکه** •

---

(١٢٣) هەر وەك وتمان فرمانی ( تێپەڕ ) هەیه و ( تێنەپەڕ )یش هەیه ، هەندێ فرمانیش هەن بۆ هەردوو لا دەست دەدەن •

(١٢٤) ئاوەڵناو ، ئەگەر له پاش ناوەوه یا راناوەوه هات ئەو کاته بێ زیاد و کەم ، له قەوارەدا ، لەگەڵیان دایه ( تاك ، یا کۆ ) ، واتـا ئەگەر ( ناوەکه ) • یا ( راناوەکه ) ( تاك )بێ ، ئەوا ئاوەڵناوەکەش تاکه ، ئەگەر ( کۆ )بێ ، ئەمیش کۆیه ، وەك :

ئەو ئازایه • ( تاك ) ئەوان ئازان • ( کۆ ) وەختی‌واش هەیه که ( ئاوەڵناو ) له پێش ( ناوەوه ) یا ( راناوه )وه دێت ، وەك :

١ ـ ژمارەی پێش ناو : **شەش** تەن گەچم کڕی •

٢ ـ ئاوەڵناوی پێش راناو : ئەو پۆلیسه **پیس** نەفەره •



منتدى إقرأ الثقافي

٢ ـ کە بتر بێ لە وشەیەك ، وەك ٠ (١٢٥)

ئەو کچە ، قژ زەردە جوانە ، دۆستمە ٠

٣ ـ کەرستەیەك بێ ، وەك :

ئەو کچە ، دوێنێ هات بۆ لای مامی ، قوتابی‌یە ٠

**جۆری ئاوەڵناو :**

لە رووی فەوارەوە ، ئاوەڵناو دەکرێ بە دوو جۆرەوە :

**١ ـ ئاوەڵناوی ساکار :**

ئاوەڵناوی ساکار بریتی‌یە لە یەك وشە وەك : ( ئازا ) ، ( سوور ) ، ( زیرەك ) ، ( دوو ) ، ( هەندێ )

ئازاد **ئازایە** ٠

**دوو** گوڵم لێ کردەوە ٠

**هەندێ** دەفتەرم کری ٠٠ ( هەندێ شتم کری ) ٠

**٢ ـ ئاوەڵناوی لێکدراو :** (١٢٦)

ئەم جۆرە پێك هاتوە لە بتر لە وشەیەك وەك : رێك و پێك ، دەستکرد ، بیست و ـ یەك

ئازاد **رێکوپێکە** ٠

---

(١٢٥) ( زیرەکە ) تاریفی نەرمین دەکات ٠
( قژ زەردە جوانــە ) ؛ فرەیزە ، تاریفی ئــەو کچــە دەکــات ٠
( دوێنێ هات بۆ لای مامی ) ؛ رستەیەکە تاریفی ئەو کچە دەکات ٠
(١٢٦) هەندێ لەم ئاوەڵناوانە ، وەختی وا هەیە کە جێگای (ئاوەلکردار) دەگرن وەختی واش هەیە جێگای ( ناو ) ٠ وەك :
أ ـ مەنجەڵەکە **دەمەونخوونە** ٠ ( ئاوەڵناو )
ب ـ مەنجەڵەکە **دەمەونخوون** دانراوە ٠ ( ئاوەلکردار )
أ ـ ئەو کورسی‌یە **دەستکردە** ٠ ( ئاوەڵناو ) ٠
ب ـ **دەستکردەکەی** من باشترە لەوەی تۆ ٠ ( ناو )
أ ـ ئەو ، بە **لەنجەولارە** ٠ ( ئاوەڵناو )
ب ـ ئەو بە **لەنجەولار** دەچێ بەرێوە ٠ ( ئاوەلکردار ) ٠



منتدى إقرأ الثقافي

ئەو کورسی‌یە **دەستکردە** •

**بیستویەک** صندوق گوێزم کڕی •

ئەو زۆر **نەرموشلە** •(١٢٧)

**ئاوەڵکردار :**

ئاوەڵکردار ئەو وشانەن کە تاریفی فرمان یاخود ئاوەڵناو دەکەن ، وەک :

أ ـ ئەو**باش** دەڕوا بە ڕێوە •

لێرەدا وشەی ( باش ) ئاوەڵکردارە ، چونکە تاریفی فرمان دەکات کە ( دەڕوا )یە •

ب ـ ئەو **فرە** وریایە •

وشەی (فرە) ئاوەڵکردارە ، چونکە تاریفی وشەی ( وریایە ) دەکات کە ئاوەڵفرمانە •

---

(١٢٧) ئەمانەش هەندێکن لەو ئاوەڵناوە لێکدراوانە • دووروو ، ئێسکوپوسک، هەنجڕهەنجڕ، تیکەتیکە، بالاَبەرز، ئێسک سووك، ڤزەرد ، دوودڵ ، بەجەرگ، بەگوڕ• تڕوفیز ، عەنعەنەوتەنتەنە ، هاتوچۆکەر، دەست بە ئەژنۆ ، بەهێز ، نیشتمان فرۆش ، ڕێ‌ڕێ، ڕاڕا ، چین‌چین ، تفەنگ بەشان، دەستبەسەر ، دووڕۆخراو ، هەپروون‌هەپروون ، صەوزوسوور •••• هتد • لێرەدا هەندێکیان دەخەینە ڕستەوە :

نیشتمان فرۆش : ئەو **نیشتمان فرۆشە** •

چین‌چین : گوڵەکان **چین‌چینن** •

گوڵەکان **چین‌چین** ڕاوەستان (ئاوەڵکردار)

تفەنگ‌بەشان ئەو **تفەنگ بەشانە** دەناسم •

دەستبەسەر : هەژار ، **دەست بە سەرە** •

دووڕۆخراو : کاوە ، **دووڕۆ خراوە** •

هەپروون هەپروون : جلەکان **هەپروون هەپروونن**

جلەکان **هەپروون هەپروون** بوون •

( ئاوەڵکردار )



منتدى إقرأ الثقافي

ح ـ وەختی واش هەیە ، کە چەند وشەیەك دەچنە جێگای ئاوەڵکردارەوە و ئەرکەکەی دەبەن بە ڕێوە ، وەك :

١ ـ **بەسەرزمانی** دەتلوێنێ •
٢ ـ **زۆرزۆر** دواکەوتوە •
٣ ـ **لەسەربان** دانیشتوە •
٤ ـ **زۆرزۆر سووری** لە بەر کردوە
٥ ـ **سێ چوار جار** گریاوە •
٦ ـ **لەماڵەوە** کۆ بوونەوە کراوە •
٧ ـ **لە ناوە ڕاستی باغچە کەدا ، لە سەر تەختەکە** ، دانیشتن •

**ئاوەڵکردار لە ڕووی قەوارەوە :**

لە ڕووی قەوارەوە ، ئاوەڵکردار دەکرێ بە دووجۆرەوە •

١ ـ **ئاوەڵکرداری ساکار :**

کە بریتی‌یە لە یەك وشە ، وەك :

ئەو **بەرز دەڕوانێ**

لێرەدا ، وشەی بەرز کە یەك وشەیە ، تاریفی فرمانی ( دەڕوانێ ) دەکات ، لەبەر ئەوە ( ئاوەڵکرداری ) ساکارە •

٢ ـ **ئاوەڵکرداری لێکدراو :**

ئەمیش بریتی‌یە لە بتر لە وشەیەك ، وەك :

دیوارەکە **چین‌چین نراوە** •

وشەی لێکدراوی ( چین‌چین ) ، ئاوەڵکردارە بۆ فرمانی (نراوە)•

لەم جۆرە بابەتە ، زمانی کوردی ، وشەی زۆرە ، ئەم وشە ئاوازە دارانە ( وشەکە ، بە ئاوازەکەی‌دا واتاکەی دەر دەکەوی = Onomatopoeia ) ش ، هەر هەمان‌دەستور جێگای ئاوەڵکرداری لێکدراو دەگرن و ئەرکەکەشی دەبەن بە ڕێوە ، وەك :

جریوەجریو : چۆلەکەکە **جریوەجریو** دەکات •



منتدى إقرأ الثقافي

زیکه‌زیک : کوڕه ، که‌م **زیکه‌زیک بکه** •
قیژه‌قیژ : مناڵه‌که **قیژه‌قیژ** ده‌کات •
قیره‌قیر : قازه‌که **قیره‌قیر** ده‌کات •

ویزه‌ویز ، میزه‌میز ، مرخه‌مرخ ، پرخه‌پرخ ، مرقه‌مرق ، فشه‌فش ، مره‌مر ، تره‌تر ، جرجر ، وشه‌وش ، مش‌مش ، فڕه‌فڕ ، خوڕه‌خوڕ ، بزه‌بز ، قاقبه‌قاق ، فیکه‌فیک ، نازونووك ، هه‌له‌قه‌مه‌له‌ق ، نرکه‌نرک ، ناڵه‌ناڵ ، هاوارهاوار ، قیژوقاژ ،

ئاخ‌وئۆخ ، بریق‌وباق ، ورته‌ورت ، زیل‌وبه‌م ، مشت‌ومڕ ، فیقه‌فیق ، زیقه‌زیق ، چیقه‌چیق ، چفه‌چف ، فچه‌فچ • نم‌نم ، گرمه‌گرم ، ته‌ق‌توق • فیك‌وفاك چریپ‌وچاپ ، شه‌ق‌وپه‌ق •••••••• هتد •

## ژماره :

هه‌ر یه‌کێ ، له هه‌ر ژماره‌یێ ، که تۆ بته‌وێ ناوێکی تایبه‌تی به‌سه‌ردا سه‌پێنراوه ، وه‌ك :

یه‌ك ، دوو ، ده ، بیست ، صه‌د ، وه هه‌زار ، دوانزه ، بیست‌و ـ دوو ، په‌نجاو‌سێ ، وه صه‌دوچوار •

له رووی قه‌واره‌وه ، ده‌کرێ به چه‌ند به‌شێکه‌و :

**ا ـ ژماره‌ی ساکار :**

ژماره‌ی ساکار بریتی‌یه ، له یه‌ك ژماره‌ی یه‌ك و شه‌یی وه‌ك : چوار ، ده ، بیست ، صه‌د •

**ب ـ ژماره‌ی لێکدراو :**

ژماره‌ی لێکدراو بریتی‌یه له ژماره‌یه‌ك ، که به ناو یه‌ك ژماره‌یه ، به‌ڵام له بنه‌ڕه‌تدا دوو ژماره‌ن‌و کراونه‌ته‌وه به یه‌ك بۆ مه‌به‌ستی ناوناني ژماره‌یه‌کی که ، وه به قه‌واره‌ش پێك هاتوه له دوو وشه : وه‌ك ( یانزده ) که پێك‌هاتوه له ( یه‌ك ) وه ( ده ) •



منتدى إقرأ الثقافي

( بیست‌ویه‌ك ) كه پێك هاتوه له ( بیست )وه ( یه‌ك ) •

**ح ـ كه‌رتی ژمـاره •**

بێ گومان ، هه‌موو كه‌سێ ده‌زانێ كه ئه‌م جۆرانه كه‌رتن ، یاخود به‌شن له ژماره‌دا ، واتا ژماره‌ی ته‌واو نین ، وه‌ك :

سێ‌چاره‌ك ، شه‌ش‌یه‌ك •

**د ـ ژمـاره‌ی ریزی :**

ئه‌م جۆره ژمارانه ، ریز كردنێ پیشان ، ده‌ده‌ن كه وه‌ك ( پلـه نیشان دان یاخود جێگا رۆشن كردنه‌وه ) • بێ وایه ، وه‌ك :

یه‌كه‌م ، شه‌شه‌م ، یه‌كه‌مین ، شه‌شه‌مین •

**ئه‌ركی ژماره له‌رسته‌دا :**

به لای منه‌وه وایه ، كه زوربه‌ی ژماره‌ی كوردی ، له رسته‌دا ، ئه‌م ئه‌ركانه ده‌به‌ن به رێوه :

أ ـ جێگای ئاوه‌ڵناو ده‌گرن و ئه‌ركه‌كه‌شی جێ به‌جێ ده‌كه‌ن وه‌ك :

١ ـ **هه‌شت** ده‌فته‌رم كری • ( ژماره‌ی ساكار )

٢ ـ **بیست‌و چوار** ده‌فته‌رم كری ( ژماره‌ی لێكدراو )

٣ ـ **سێ چاره‌ك** گۆشتی كرێوه : ( كه‌رتی ژماره )

٤ ـ | ئه‌وه **چواره‌مه** | ئه‌وه **چواره‌م** قوتابی‌یه له‌پۆلدا | ئه‌وه **چواره‌مین** قوتابی‌یه له پۆلدا | : ( ژماره‌ی ریزی )

ب ـ وه‌ختی واش هه‌یه ، كه جێگای ناو ده‌گرێ و ئه‌ركه‌كه‌ی ده‌با بـه رێوه ، وه‌ك :

**ئه‌وه شه‌شه‌مه•**

به‌لای منه‌وه ئه‌م رسته‌یه به دوو جۆر ده‌درێته قه‌ڵه‌م ، هی یه‌كه‌میان وه‌ك بڵێیت : ( ئه‌وه پیاوه )( شه‌شه‌مه ) واتا جێگـای ناوی ( پیـاوه )ی



منتدى إقرأ الثقافي

گرتوه ، لەبەر ئەوە من بە ناوی دادەنێم ، وە هی دووەمیان وەک بڵێت : ( ئەوە ئازایە ) ، واتا وشەی ( شەشەمە ) جێگای وشەی (ئازایە)ی گرتوە کە ئاوەڵناوە ، لە بەر ئەوە بە ئاوەڵناوی ئەدەمە قەڵەم ، ئەمە جگە لەوەی کە هەمان ئەرک دەبا بە رێوە •

ح ـ هەندێ جار دەچێتە جێگای ئاوەڵکردار و ئەرکەکەشی دەبا بە رێوە ، وەک :

ئەو بە **شەشەم** دەرچووە •

لێرەدا ، لە بەر ئەوەی کە وشەی ( شەشەم ) تاریفی فرمانەکە دەکات کە ( دەرچووە )یە ، بە ئاوەڵکردار دەدرێتە قەڵەم •



منتدى إقرأ الثقافي

# فەرهەنگۆکی زاراوەکان

| زاراو | مـاناکـەی |
| --- | --- |
| دەنگ‌سازی | ( فۆنۆلۆژی ) یاخود زانستی دەنگەکان |
| دەنگ‌ساز | ئەو زانایەیە کە خەریکی لێکۆڵینەوەی دەنگەکانی زمانە یاخود ئۆسایە تیایاندا • |
| فۆنیم | ( وشە ) یاخود کۆمەڵە دەنگی رێك و پێك • |
| مۆرفیم | بچووکترین پارچەی واتا داری ( زمان ) • |
| وشەساز | ئەو زانایەیەکە خەریکی لێکۆڵینەوەی مۆرفیمەکانی زمانە • |
| وشەسازی | زانستیی مۆرفیمی زمان (مۆرفۆلۆژی) |
| رستەساز | ئەو زانایەیە کە خەریکی لێکۆڵینەوەی رستەیە لە هەموو روویەکەوە |
| رستەسازی | زانستی رستەی زمان |
| یاسا | ( نظـام ) |
| دەنگە ئاوازە دارەکان کۆنسوناتەکان | ( کۆنسوناتەکان — Consonants ) |
| کۆنسوناتە دەنگدارەکان | (Voiced) |
| کۆنسوناتە بێ‌دەنگەکان | (Voiceless) |
| گۆ | ( التلفظ ) |
| بزوێنەکان | Vowels |
| ئەندامانی ئاخاوتن | ( أعضاء النطق ) |
| هێشوە کۆنسونانت | (Consonant- Clusters) |
| هێشوە بزوێن | Vowel Clusters) |
| بزوێنی دوولۆ | (Diphthong) |
| بزوێنی سێ‌لۆ | (Triphthong) |



منتدى إقرأ الثقافي

| | |
|---|---|
| ژێیە دەنگییەکان | ( الأوتار الصوتية ) |
| بەند | (Affixes) |
| پێشبەند | (Prefixes) |
| پاشبەند | (Suffixes) |
| ناوبەند | (Infixes) |
| بەندسازی | زانستیی بەند ( بەندناسی ) |
| بەندساز | زانای زانستیی بەندە ( زانای بەندسازی ) |
| هێز | سترێس (Stress) یاخود سوپەرفیکس (Superfixes) |
| رستەی فەرماندار | ( جملة مبني للمعلوم ) |
| رستەی بێ فەرماندار | ( جملة مبني للمجهول ) |
| فرمانکەر | ( فاعل ) |
| فرمانبەر | ( مفعول به ) |
| فرمان<br>کردار | ( فعل ) |
| ئاوەڵناو<br>هەڤاڵناو | ( الصفة ) |
| ئاوەڵکردار<br>ئاوەڵفرمان | ( الظروف ) |
| فەرمان | ( أمر ) |
| فرمانی رابوردوو | فعل ماضي |
| « دادێ | « مستقبل |
| « نهو | « حاضر |
| « تێپەڕ | « متعدى |
| « تێنەپەڕ | « لازم |



منتدى إقرأ الثقافي

# سەرچاوە ئینگلیزی‌یەکان


1. Kurdish Dialect studies, Mackenzie, 1.
   Oxford University Press 1961.

2. Bloom field, Leonard, Language, New York
   Henry Holt and Co. 1938.

3. The Dialect of Auroman (Hawráamán I Luhón)
   by. D.N. Mackenzie, Kobenhavn 1966.

4. Fries, C.C. Teaching and Learning English as a foriegn
   Language, An Arbor Michigan. The University of
   Michigan Press, 1954.

5. Jone, Danial, An Outline of English Phonetics, 8th Edition
   Cambridge, Wheffer and Sons Ltd 1957.

6. Hocket, Charles, F.A Course In Moderen Linguistics
   New York, The Macmilan Co., 1958.

7. An English Phonetics Course, by Paul Christophersen.

8. Ind - European Philology, W.B. Lockwood. M.A., D.L.TT

9. The Avestan Hymn to Mithra, Ilya Garshvitch
   Cambridge University Press, 1967.

10. The English Language, G.A. Sambrook.

11. English 901 Book 1, Peter Strevens and English Language
    Services, Collier - Macmillan Limeted, London.

12. The Avestan Language, S.N. Sokolov, Moscow. 1967.

13. XÖNAWARY - BAW. TEWFYQ. WEHBY. 1933.

14. Kurdish English Dictioary, Tawfiq-Wahby and
    C-J- Edmands.

15. A Course in English Linguistics, Khalil, I.AL-Hamash
    and Jamal J. Abdullah.




منتدى إقرأ الثقافي

## سەرچاوە عارەبی


١٦ـ فقه اللغة وخصائص اللغة العربية ـ محمد المبارك
١٧ـ علم اللغة ـ الدكتور علي عبدالواحد
١٨ـ ايران في عهد الساسانيين ـ ارثر كريستنس ، ترجمه الى العربية ـ يحيى الخشاب ٠
١٩ـ تراث فارس ا٠ج ديرى ـ نقله الى العربية أساتذة كلية الآداب بالقاهرة ( محمد كفاحي ، أحمد الساداتي ، السيد يعقوب بكر ومحمد صقر الخفاجي ) ٠
٢٠ـ مقدمة علم اللغة ـ الدكتور محمود السعران مصر ١٩٦٢


## سەرچاوەی فارسی


٢١ـ گزارش گاتاها ـ سروودهای زرتشت ها ٣٠ نوشتەم ٠ اورنگ
٢٢ـ گزارش بهرام يشت يا پيروزی نامه م٠اَورنگ
٢٣ـ بررسی يسناها (٩) نوشته م٠اَورنگ
٢٤ـ بررسی يسناها (١٠) نوشته م٠اَورنگ


## سەرچاوەی کوردی


٢٥ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی یەکەم ١٩٧٣
٢٦ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ علاءالدین سجادی
٢٧ـ ڕێزمانی کوردی ـ نوری علی امین
٢٨ـ چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا د٠ن فەخری چاپخانەی ئاداب ـ نەجەف ـ ١٩٧٣ ٠
٢٩ـ فەرهەنگی خاڵ ( ج ـ ١ ) شێخ محەمەدی خاڵ ٠
٣٠ـ لە کوێوە دەست بکەین بە دەستوور سازی ڕێزمانی کوردی چاپخانەی کۆڕ ٠
٣١ـ ئەو سەر چاوانەش کە لە پێشەکییەکەدا نووسراون ٠
٣٢ـ دەستووری زمانی کوردی ( ج ـ ١ ) تەوفیق وەهبی





منتدى إقرأ الثقافي

# نــاوەڕۆك



منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

| سەرباسەکان | لاپەڕە |
| --- | --- |




منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

# ئیندێكس = INDEX





منتدى إقرأ الثقافي

# ئیندێکس = INDEX





منتدى إقرأ الثقافي

# ئیندێکس = INDEX

لاپەڕە





منتدى إقرأ الثقافي

# وشـەی ریـز

بۆ دەرهێنانی هەر بەرهەمێك چە ئەدەبی بێت یاخود زانستی چـە لە رووی رۆشن کردنەوەی هەندێ شتی پەناواکی وە چە ، لە رووی چۆنی‌یەتی رێگا دانان و پشکنین و لێکۆڵینەوە بۆ پەردە لادان ، لە هەندی شتی نەزانراو ، یاخود رێگا دانان بۆ چۆنی‌یەتی دەرخستنی ئەو مەبەستەی کە نووسەر هەیەتی لەگەڵ هەندێ رای تری باودا ، وەبۆ دەر هێنانی بەرهەمێك کە بە شێوەیەکی رەوا و زانستی‌یانە وا سـوود بـەخش بێ ، پێویستی بە پەنا بردن بە زانایان و شارەزایان هەیە •

جا ، منیش لەم رووەوە ، بۆ ئەم بەرهەمە بچکۆلەیە ، بەبێ پەروا و چەنی و چۆنی پەنام بردوەتە چەند مامۆستایەکی بە رێز و شـارەزا • ئەوەی کە زۆر شایەنی سوپاس و رێزە ، هەر مامۆستایێ لەوانە زۆر بە روو خۆشی و خەندەوە ئامادە بووە بـۆ یارمـەتی دانـم ، وە بە تایبەتی مامۆستا د• پاکیزە حیلمی کە زۆر لە وەختی سوود بەخشی خۆی تەرخان ئەکرد بۆ لێکۆڵینەوە و رێگا پێشان دان ، وە بۆ دانانی بناغەی ئەم بەرهەمە هەروەها دەست نیشان کردنی هەندێ سەرچاوەی نایاب بۆ ئەم مەبەستە •

جگە لەمەش ، هەروەك لە پێشەوە وتم ، یارمەتی تریش دراوم ، کە ئەو یارمەتی یانەش وەك خستنە دەستی هەندێ سەرچاوەی ئەو تۆ کە بە تاك و تەراك یاخود بە دەگمەن دەست ئەکەوێ ، ئەنجا بەم بۆنەیەوە سۆپاس و رێزمان پێشکەش بە ( کاك عەزیز رەحیم ) و کاك ( حوسەین جاف ) و کاك ( مەجید رەشید ) ئەکەم ، هەروەها بۆ ( کاك فاروق ئامیدی ) کە هەندێ شتی نا رۆشن پێویست بەم بەرهـەمـە لـە زاری کـرمـانجی زووروودا هەبوە بۆ منی رۆشن کردوەتەوە ، وە دیسانەوە سوپاس بۆ ئەو بە رێزانەی کە ئەم بەرهەمەیان نرخاندووە •

**( محەمەد ئەمین هەورامانی )**



منتدى إقرأ الثقافي

MINISTRY OF INFORMATION
GENERAL DIRECTORATE OF KURDISH CULTURE

# An Introduction TO KURDISH LANGUAGE PHILOLOGY

BY
M. A. Hawramany

المكتبة المركزية / جامعة السليمانية

نرخی (٢٥٠) فلسه

AL-MA'ARIF PRESS - BAGHDAD
1974

منتدى إقرأ الثقافي

# AN INTRODUCTION TO KURDISH LANGUAGE PHILOLOGY

BY

M. A. Hawramany

AL-MA'ARIF PRESS - BAGHDAD
1974

منتدى إقرأ الثقافي